## لەم ژمارەیەدا



# وردەی ژمارە

ئەوی راستی بێ ئەنجامی ئەو نوسراوو بانگەوازەی بلاومان کردەوە بۆ نووسەرە بەرێزەکانمان تا بەنووسین‌و بەرهەمی جوان‌و پوخت بەشداریی گۆڤاری ( بەیان ) بکەن تارادەیەکی باش سوود بەخش‌و بەکەلك بوو کەمایەی سوپاسێکی گەرم‌و بێپایانە ... نووسەرو ئەدیب‌و خاوەن قەلەم‌و وشەی پیرۆزی کوردی‌و بەشداریی دلسۆزانەیان لە ئەرکی بەرێوە بردن‌و گەشە پێدانی ( بەیان )دا بەلای ئێمەوە تاقە سەرچاوەی ژیان‌و خەملاندن‌و بەرز بوونەوەو پێشکەوتنی رادەی ئەم گۆڤارەیەو لەرووی ئەدەبی‌و رۆشن بیریشەوە چەند هەنگاوێکی پیرۆزە لەم رووەوە ئەیهاوێ . جابەم بۆنەیەوە بەپێویستی ئەزانین کە تکایەکی برایانە لەو نووسەرە بەرێزانە بکەین کە زیاتر بابەتی دراسەت‌و لێکۆلینەوەو رەخنەی بابەتی‌و نووسینی کۆمەلایەتی‌و بەرهەمی وەرگێران لە ئەدەبی گەلانەوە .. هتد مان بۆ رەوانە بفەرموون .

وەك وتمان ئەنجامی بانگەوازو نوسراوەکانمان‌و بە دەنگەوەهاتن‌و بەتەنگەوەهاتن‌و بوو . زۆر کەرەسەو بابەتی جوان‌و نایابمان بۆ هات ، لەناو ئەوانەشدا هیوامان بۆ هات کە بۆ گۆڤاری ( بەیان ) دەستی نەئەدا ، ئەم کۆمەگی‌و پشتگیریە نیشانەی ئەوەیە کە بەیان ئاوێنەیەکی هەست‌و مەبەستی نووسەران‌و خوێنەرانەو ئاسۆیەکی گەش‌و روونا کە بۆ بلاوکردنەوەی تیشکی بەهرەو بەرهەمی نایابی نووسەرانی خۆشەویست ... هیوادارین پردی ئەم پەیوەندی‌و هاوکاریەی نێوان نووسەران‌و بەیان رۆژ بە رۆژ پتەو ترو سەخت تر بێت .

# بەیان


گۆڤارێکی ونێژەیی وهونەری گشتی یە
وەزارەتی راگەیاندن
دەزگای هاوکاری چاپ وبلاوکردنەوەی کوردی
«دار التضامن للطباعة والنشر الكردية»
مانگی جارێك دەری ئەکات

● سەرۆکی نووسین جەمال بابان
● سکرتێری نووسین نەریمان
● دەرهێنانی هونەری محمد عارف
● خۆشنووس ئازاد ئەحمەد
چاپخانەی "دار الحرية" دار الحكومة"


نرخی ٥٠ فلسە

# ڕۆژنامەی کوردی لە کوردستانی ئێران دا

— هێمن —



• کەم مێژوو نووسی ئێرانی هەیە ددانی خێری پێدا هێنابێن ، شتێکی وپێچووی لەبارەماندا نووسیبێ ، کەم یا زۆر سەرو سەکوتی نەکوتابێن • سەیرە ، بەڕاستی سەیرە • لەوەتی مێژوو نووسراوە تەوە ئێمە وەکەس نەڕزاوین ، هەڵمان نەکوتاوەتە سەر ملکو ماشی کەس ، دەستمان بەکلاوی خۆمانەوە گرتوە بانەیبا •

هەر دوژمن گەمارۆی ئێمەی داوە، هەر نەتەوەی پەلاماری بۆ ئێمە هێناوە ، هەر بێگانە بەگژ ئێمەدا هاتوە ، هەر زۆردار و یستوویەتی بمانگرێ ، بمان کوژێ ، بمان کوتێ ، تالانمان بکا ، خاوو خێزانمان وەدەشتێ بخاو ماڵو حاڵمان لێ تێکو پێکبداو ژیانمان بشێوێنێ •

**هەمیشەهەر داگیرکەران هێرشیان هێناوەتە سەر نیشتمانو زێدەکەمانو ویستوویانە وڵاتی بابو باپیرمان لێ داگیر بکەن • ئێمە ئەگەر دەستەوە ـ کەریمان کردوە ، ئەگەر بۆ بەربەرەکانی ڕاپەریوین ، ئەگەر داومانەتە چیا ، ئەگەر ڕۆبووینە چەک ، ئەگەر پێشی زۆردارمان گرتوە ، بەگژ داگیرکەردا هاتووینەوە ، تەنیاو تەنیا بۆ پاراستنی گیان و ماڵو نامووسی خۆمان بووە • جا جاری وابووە قوربانی زۆرمان داوە ،** خوێنمان بەلێشاو ڕژاوە ، لەشمان بەکەڵەکە لەمەیدانێ بەجێماوەو جاری واش بووە بەدەستمانەوە هاتوە بەر سینگەمان لە دوژمن بڕیوەتەوە ، دامان پەڵۆسیوە ، دابڕدابڕمان تێخستوە ، تەنانەت جوقەوارمان لێبڕیوە ، بەڵام لە هەموو حاڵێکدا هەق هەر بەلای ئێمەوە بووە • چونکە بەرگریمان کردوە ، لەبناری چیا سەختو هەزار بەهەزارەـ کانی خۆماندا وەدەست هاتووین • بەرگریش مافی ڕەوای هەمو زیندەوارێکی سەر ئەم جیهانەیەو بەتاوان ناژمێردرێ •

**کەچی مێژووی زۆرداران بخوێننەوە ، تەماشابکەن ، هەرئێمە تاوانبارو گوناهکارین ، هەرئێمە پیاو ـ خراپو بەدناوین • بۆ ؟ چونکە بێهێزو بێ دەستەڵاتین • چونکە قەڵەم بەدەس دوژمنمانەوە بووە •**

مێژوونووسەکانی بێگانە کە زۆربەیان بەنانی زۆرداران چاویان پشکوتوەو بەورکەی داگیرکەران بەخێو ـ کراون پێیان لەراستی خستوەو واقیعیان شاردۆتەوە • هەزاران جنێوی سەربەکولکەیان پێداوینو قسەی ساردو سووکیان لە پارسەنگ ناوینو تووکو لەعنەتیان لێ کردووین ، کەبۆچی دەستمان لە سەردەست دانەناوە تا خاوەنشکۆیان بمان کوژن ؟ بۆچی چاومان دانەیەشتوە تابەکەیفی خۆیان دەستدرێژی بۆ ماڵو گیانو ناموسمان بکەن ؟ بۆ وەدەست هاتو ـ وین ؟ بۆ بەرگریمان کردوە ؟

**سەرتاسەر کتێبی ئەو مێژوو نووسانە پڕن لەهێرشی ناڕەوا بۆسەر نەتەوەی زۆرلێکراوو بەشخوراوی کورد • بەڵام لە لابەلای لاپەڕەکانی ئەم کتێبە پڕلەتەوسو پلار و لاتاوانە ـ شدا جاروبار دەتوانین تروسکایی ڕاستی بدۆزینەوە •**

بۆ نموونە لەنیوەی دووهەمی چەرخی بیستەمدا لەساڵی ١٣٥٠ی هەتاوی ١٩٧١ی زاینیدا کتێبێک بەناوی « اوضاع ایران درجنگ اول یا تاریخ رضائیه » نووسراوی ( محمد أمدن ) بلاوبۆتەوە کە بەراستی پەڵەی شەرمە بەداوێنی زانستەوە • **ئەم کتێبە کە کابرایەکی ئازەری بەفارسیەکی نارێکو نالەبارو پڕ لەغەڵەت وپەڵەت نووسیویەتی ، پڕە لەجنێوو قسەی سوکو گاڵتەکردن بەگەلی کورد لە کوردستانی ئێرانو کارێکی پێ کردووین با بە دەواری شڕی ناکا • بەتایبەتی هێرشی وای بردۆتە سەر شەهیدی ڕێگای ڕزگاری گەلی کورد ، قارەمانی کۆڵنەدەر سمایل ئاغای سمکۆ کە قەت ئەسکەندەربەگی تورکمان خاوەنی « عالم آرای عباسی » نەیبردۆتە سەر ئەمیرخانی برادۆست ، خانی لەپ زێڕین •**

بەڵام دەکرێ مێژوونووسێکی وردو وریای کورد زۆر ڕاستی وا کە نووسەر بەراوەژووی نیشان داون لە لابەلای ئەم کتێبەدا بدۆزێتەوە • بۆ نموونە ئەم نووسەرە باسی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی دەکا کە پەنجاو چوار ساڵ لەوەی پێش (ساڵی ١٣٤٠ی کۆچی) لە کوردستانی ئێران بڵاوبۆتەوەو ئێمە زۆرمان لە سەر نەدەزانی ، کلیشەی ڕۆژنامەکەشی چاپ کردوە • من لێرەدا دەمەوێ ئەوی ئەم کابرایە لەسەر دەرچوونی ئەم ڕۆژنامە نووسیویەتی بکەمە کوردی • لەلاپەڕەی

٣٦٩ لەژێر عینوانی « سیمتقوو روزنامه کردی » دا نووسیویەتی :

« **رۆژێک شێخ عەبدوللا (لەپیاوە تیگەیشتووەکانی سمیتقوو لـە خزمانی سەید تەها ) هاتە لایمن‌و لەنێو قسان‌دا گوتی : ئاغا (یانی سمیتقو) دەیەوێ لە ورمێ رۆژنامەیەک بڵاو بکرێتەوە ، ئایا بەڕای تۆ بەچ ئەندازەو تیراژێک‌دەتوانین رۆژنامەیەک لەو شارەدا بڵاو بکەینەوە؟ کەهەم سەنگین‌بێ‌و هەم جوان‌و سەرنج راکێش** » نووسەر لە جوابی شـــێخ عەبدوللادا وای‌گوت :

« بەداخەوە پیتەکانی چـاپخانەی ئێمە زۆر کەمن ، بەشی چاپی رۆژنامە ناکەن · شێخ عەبدوللا کە ئەم وەڵامەی بیست ، بەتوندی گۆڕاو حاڵی شێوا · منیش ترسام‌و لەهەڵەی خۆم گەیشتم‌و گوتم :

« ئەگەر وێرای کرێکارانی دەز ـ **گاکەی خۆمان تێبکوشین لەوانەیە کەم‌و کوریەکانی نەهێڵین‌و بتوانین رۆژنامەکە بڵاوبکەینەوە · بەڵام دەبێ زۆر زەحمەت بکێشین تا ئامـــرازی پێویست ئامادە بکەین** » لێرەدا ڕەنگ‌و رووی شـــێخ عەبدوڵلا کرایەوەو هیچ جوابی نەداوە · ئەگەرچی ئەو بەڵینیدا کە هەق دەستی کاربەدەست‌و کرێکارانی چاپخانەکـــە بدا ، بەڵام نەدەکرا لەو رۆژیدا پشت بەبەڵینی کوردەکان ببەسترێ · چونکە سەرێچی لە فەرمانی سمیتقو لەو هەل‌و مەرجیدا گاڵتە بەگیانی خۆکردن بوو · پاش ئەوەی چەند رۆژێک لـەو بارەدا بیرم کردەوە ، عـەقلم بەهیچ کـــوێ رانەگەیشت · ناچار کتێبخانەو چاپخاـ نەکەی خۆم داخست ، شەوێ دەگـەڵ نۆگەرێکم‌و چەند بەڵەدی دیکە لە شاری وەدەر کەوتم » ·

لێرەدا نووسەرباسی راکردنی‌خۆی دەکاو پێوەندی بە ئێمەوەنیەو لە ئاخری لاپەرەی ٣٧٠دا دەست پێدەکاتەوە :

« **بەڵێ پاش‌راکردن‌و ئاوارەبوونی بەناچاری من سمیتقو دەستووری دا بوو**

**کەکتیبخانەو چاپخانەکەم داگـــیر بکەن · مەلا موحەممەدی تورجـــانی ناوێکیشی مەئموور کـردبوو رۆژنامەی کـــوردی چـــاپ‌و بڵاوبکاتەوەو ئاغای مەلاموحەممەدی تورجانیش نەی‌کـردبوە ناپیاوی بەشێکی لە کتێبە بەنرخـەکانی کتێبخانەی من هەڵگرتبوو و بردبوویەوە ماڵە خۆی · هەربەوەندەوە رانەوەستا ـ بوو ، ناوی چاپخانەکەشمی گۆڕیبوو · تابلۆوی چاپخانەی « تمدن »ی فڕێدابوو و تابلۆی چاپخانەی «غیرەت»ی هەڵاوەـ سیبوو · رۆژنامەیەکیان بە زمـــانی فارسی‌و کوردی بڵاوکردبۆوە کەحەو ـ تووی جارێک دەردەچوو · ناوی «رۆژی کورد ـ شەوی عەجەم» بووە کە دوایـە بۆتـە « رۆژی‌کوردو ئاخری بۆتـــە « کورد »**[1] · ئێمە ئەوەتا چەند دێرێک لە ژمارەی ساڵی هەوەڵ (١٣٤٠) بـــۆ نموونە لێرەدا بلاو دەکەینەوە :

نووسەر چەند لاپەڕەی دیکـــەی بەباسی شەڕو گێشەو کارەساتەکانی نێو خۆی ئـــەو سەر دەمی ئێران رەش ـ کردۆتەوەو دیسان بای داوەتەوە سەر ـ باسی سمکۆ و نوسیویەتی :

« خەڵک کە بە هیوا بوون هێزی دەوڵەتی سمیتقۆ رام‌و بەردەست دەکا ، کـــە خەبەری راپەرینی ( لاهووتی ) ،

کوژرانی ( خـــالو قوربان ) ، راکردنو
بلاوبوونی چریکەکانی ئەو وهاتنی سەید
تەهایان بیست بەجاریکی ناهومیـــــد
بوون · لەو لاشەوە کوردەکان بەو زال
بوونانە ئازاترو باوخۆش‌تر و لەخـــۆ
بایی‌تر بـــــوون · ئێستا کارەساتی

چاپ دەکراو بەلگەی بە نرخی تی‌داهەن
وەردەگرینو لێرەدا بلاوی دەکەینەوە ·

نووسەر ئەسلی پاشکۆی فارسی
رۆژنامەکەی لە لاپەرەی ٣٨٠دا چـــاپ
کردوە · ئەوەتا منیش دەیکەمە کوردی:




**« سمیتقو بێجگە لە بلاوکردنەوەی
رۆژنامەی کوردی « کورد » لـــە ورمێ
ڕێکخراوێکی بـــۆ وەرگرتنی گومرگیش
دروست کردبوو · لەهەر شتێکی کـــە
خەلک لە ورمێ‌را دەیانبرد شارەکانی‌تر
( مەراغە – خۆی – تەورێز ) گومرگی
دەستاندو پەتەی چـــــاپی بەکوردی
دەدانێ · ئەوەتاش نموونەی ئەوپەتـــە
مێژوویی‌یە :**

کوژرانی [خالو قوربان] لـــە رۆژنامەی
کوردەکان کە بە ناوی [کورد] لە ورمێ

## کارەساتی کوژرانی خالۆ قوربان

### لەپاشکۆی رۆژنامەی ژمارە دووی « کورد » چاپی ورمێ

« هەوالنووسی ئێمە دەنووســی
کوژرانی خالۆقوربانو شکانی لەشکرە-
کەی بۆ ئاگاداری خوێنەرانی خوشە -
ویست روون دەکـــەمەوە · رۆژ ٢٨ی
رەمەزانی ١٣٤٠ی مانگی لـــە کاتێکدا
کەلەشکری کورد لە ژێـــر فەرماندەیی

« سەید تەها ئەفەندی» لە دەورو پشتی گوندی « قوزلو »ی خاکی هەوشار خۆی بۆ پەلامار بردنەسەر « صاین قلعـــە » ساز دەکرد ، خـــەبەری دەستدرێژی «خالۆ قوربان» لە «میاندواو» وە بـــۆ «شاروێران» و «سابـــلاغ» بەهـــۆی دووسواری سەرداری موکری گەیشت ٠ هەر دەسبەجێ روو لە سابلاغ کراوە ٠ شەوی ٢٩ی رەمەزان لە «بۆکان»مانەوە ، بەیانی زوو رۆیشتن ٠ دوو ســـەعاتی رۆژ مابوو مەزنی عەشیرەتەکان لە دەورو بەری گوندی «دەرمان» دەگـــەڵ سەید تەها ئەفەندی کۆری راوێژو وتووێژیان گرت ، نەخشەی پەلامار بردنە ســـەر خالۆ قوربانیان کێشا ، ئاوایان دانا :

**« جانگیربەگ » لە عێلی هەرکی ، « ئەسکەندەرخان » لە خەلکی برادۆست «هەمز ئاغـا» لەعێـــلی مامەش « ئەمیر ئەسعەد»ی دێبۆکریو «سالار سەعید» لەخەتی «لاچین»ەوە بچـن ٠ بڕیاریاندا لە جەنگەی بوولێلی بانگی شێواندا ، لە سەعاتی دیاری کراودا ، لــەسێ لاوە پەلامار بەرنو تەقە دەست پێبکرێ ٠ « ئەمیر ولعەشایر» و «ئەمیر ئەسعەد» و «سالار سەعید» بەپێی بڕیاری گشتی لە تاریکو روونی بەیانی ٢٩یرەمەزاندا لە سەر کێوی «زاوابووک»را لەشکری خـــالۆ قوربانیان کـە لەسەر تەپکی « داشامەجید » لەنێـــو ســەنگەراندا دامەزرابوون ، دایەبـــەر دەستڕێژ ٠ لەهەردووک لاوە شەڕ دەست پی کرا ٠**

سوارانی کـــورد نەیان هێشت شەڕەکە درێژەی بکێشێ،لەسەر جڵەوان ڕکێف کوت هەڵیان کوتا سەر لەشکری عەجەمان ، خـــۆیان دەپاڵ هاویشتن ، بەلوولەی تفـــەنگان وە دەریان نان ٠ هێندیک بەدیل گـــیران ، هیندیک کوژران ، ئەوی دەرچوو بەپەلەپرووزە بەرەو «ئیندرقاش» بۆلای خالـۆقوربان هەڵاتن ٠ سوارەکانی ئەمیرولعە شـــایر «حاجی ســـطوة السلطنە»ی حـــاکمی ساپلاخیان بەدیل گرت ٠ ســـوارەکانی ئەمیر ئەسعەد «متراليوز»یکیان وەدەست کـــەوت ٠ ئەسپو یەسترو تفەنگیکی زۆریش گیرا ٠ ئەمیرولعەشایر ، ئـــەمیر ئەسعەد ، سالار سعید لە پاش ئەوەی لە کوشتنو بەدیل گرتنی سەربازەکانی «داشامەجید» بوونەوە ،چەند سوارێکیان بەدووی سەربازە راکردوەکان دانارد ٠ بۆ خۆشیان پەلاماریان دا قۆلێکی دیکەی لەشکری خالۆقوربان کە لەســـەر کێوی «خەزایی» بـــــوون ٠ ئەوانیش پاش تەقەیەکی کەم سەنگەریان بەتاڵ کـــردو هەڵاتـــــن ٠ هیندیکیان وە بەرهاتن کوژرانو هێندێکیش بەدیل گـــیران ٠ لەوێش ئەسپو تفەنگێکی زۆر وەدەست کەوت ٠ سوارەکانی سالار سەعیـــــد متراليوزیکیان گرت ٠

دەگەڵکوو شکەستەی لە شکری ـ ئەودوو شوێنە وابە شپرزەیی گەینەوە ئیندرقاش ترس لەنیو لەشکری خـــالۆ قوربان کەوت وپاك هەڵاتن ٠ ئاغایانی مەنکورو هەرکیو زەرزا جلدانە لێیان وەخۆکەوتن وئازایانە دایان گـــڕانێ ٠ لەو شەڕەدا خالۆ قوربانو چەند ئەفسەر وسەرباز کـــــوژران ٠ زۆریش بەدیل گیران ٠ پیاوەکانی سەید تەها ئەفەندی (٣) تۆپ ، سوارەی مەنگوری تۆپیکو سوارەکانی هەرکی (٢) تـــۆپی گەورەو متراليوزیکو ئەسپاپو تفـــــەنگیکی زۆریان بەتاڵان گرت ٠ هێندیک دەڵێن سوارەی ئەحمەدی گـــــولاوی ئاغای مەنگورو هێندێک دەڵێن ئەحمەدخـــانی هەرکی خالۆ قوربانی کوشتوە ٠

**شکەستەی لەشکری خالۆ قوربان زور بەیان گەرانەوە بۆ وڵاتی خـــۆیانو دوو سەد کەسێکیش چوونە تەورێز ٠ کۆلۆنیل « نصرالله خـــان » فەرماندەی ژاندارمریش● لە « صاین قلعە »وە بەرەو موکری وەرێ کەوت ، بەتەواوی لـــەو رووداوە بێخـــــەبەر بوو ٠ بۆئەوەی دەگەڵ خالوقوربان یەك بگرنـــەوە زۆر بەفیزەوە بۆلای بۆکان هات ٠**

ئەمیر ئەسعەد کەئـــەو خەبەرەی بیست زۆر بەپەلە خۆی گەیاندە «ئەمیر ئاباد»ی تەنیشت بۆکان ٠ کۆلۆنیل کە دەگاتە بۆکانێو خەبەری کوژرانی خالو

قوربان‌و شکان‌و بلاوبوونی لەشکرەکەی دەزانی ، فیزمالکی دەداتێ ، بۆکان بەجێ‌دێلێ ، بۆ «صاين قلعه» دەگەڕێتەوە ۰

سوارەکانی بەگزادەو سەرداری موکری وە دوویان دەکەون، ئەمیر ئەسعەد و ئاغاکانی دیکەی دێبۆکری بە ڕکێف کوت خۆ دەگەیەننە یارمەتی سوارانی موکری‌و بەگزادە۰ ئۆردووی ژاندارمری لەکێوی پشت گوندی «ئالبلاغ» گەمارۆ دەدەن ۰ زۆران دەکوژن‌و بەدیل دەگرن‌و دەسکەوتیش گەلێکە ۰ لەو پەلامارەدا « سولتان عبدالحمید خان » ئەفسەری ژاندارمری کوژراوە ۰ کۆلۆنیل دەگەل پاشماوەی لەشکرەکەی شەوانە لەکێو دێتەخواری‌و بەلاڕێدا هەڵدێ ۰

ئاغایانی بەگزادەی فەیزوڵلابەگی تۆپیکی گەورەیان گرت‌و ناردیان بۆ « چهریق » بەراستی ئازایەتی‌و لە خۆبووردنی گشت ئاغایانی موکری بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی ئەرکی نیشتمانی‌و نەتەوایەتی جێگای سوپاسە ۰ هیوادارم لە ڕێگای هەق ناسیەوە ئەوەی لەو ڕۆژنامە تاقانەدا چاپ بفەرموون ۰ ع ۰ ش » ۰

دیارە ئاغای «تمدن» ئەم باسەی بۆیە نەهێناوەتە گۆڕێ گۆشەیەك لە مێژووی ڕۆژنامەگەری گەلی کورد لە کوردستانی ئێران ڕووناك بکاتەوە ، بەڵکوو مەبەستی شتێکی دیکەیەو ویستوویەتی ڕق‌و قینی تایبەتی خۆی بەرامبەر بەسەرکردایەتی ڕاپەڕینی ئەو سەردەمی گەلی کورد دەرببڕێ‌و بۆمان بگێڕێتەوە کەچۆن حازر نەبووە هاوکاری سمکۆ بکاو چۆن چاپخانەکەی لێ موسادەرە کراوە ۰ جابۆیە هیچ نەی نووسیوە ئەو ڕۆژنامەیە چەند لاپەڕە بووە ، ئەندازەی چەند بووە ، کەی دەرچووە ، کەنگی پەکی کەوتوەو لەسەریەك چەند ژمارەی بلاو بۆتەوە ۰ بەداخەوە ئەم کلیشەش کە چاپ کراوە ، دەگەل ئەوەش‌دا کەساڵ‌و مانگ‌و ڕۆژی دیارە ، ژمارەی بەسەرەوە نیە ۰ ئێمەش جارێ هیچ بەڵگەیەکی ترمان بەدەستەوە نیە ۰ مەگەر لەبەرخۆمانەوە بێ بەڵگە لێکی‌دەینەوەو کەمێك لەڕاستی نیزیك بینەوە ۰

**ئەگەر قسەی ئەم‌نووسەرە بەڕێزە ڕاست‌بێ‌و ئەو ڕۆژنامە سێ‌جاری ناوگۆڕی کردبێ ، ئەوە دەردەکەوێ کە ئەو ڕۆژنامە لانی‌کەم دەبێ سێ ژمارەی لێ دەرچووبێ ۰ ئەم ژمارەش کەکلیشەکەمان لەبەر چاوە لەڕۆژی ١٢ی شەوالی ١٣٤٠دا بلاوکراوەتەوە۰ ئەگەر دڵنیابین هەمو جارێ لە ڕۆژێکی دیاری‌کراو لەحەوتوودا چاپ‌کرابێ ، ئەوە دەبێ ژمارە یەکەمی لەڕۆژی ٢٧ ـ ٢٨ی ڕەمەزان‌و ژمارەی دووهەمی لەڕۆژی ٥ی شەوال‌و ژمارەی سێهەمی لە ١٢ی ئەم مانگەدا بلاوبووبێتەوە ۰ بەڵام من بۆخۆم بەچەند دەلیل لەو حیساب‌و لێکدانەوەیە دڕدۆنگم :**

١ ـ هەرچەند من بۆخۆم ئەم دیوە ، بەڵام لە گەورەپیاوانی ئەم دیوو ئەو دیوم بیستوە کەماموستا مەلا موحەممەدی تورجانی یاقزلجی زانایەکی گەورەو ئەدیبێکی شارەزای کورد بووە۰ هیچ وێ‌ناچێ ناوێکی وا نالەبار « ڕۆژی کورد ـ شەوی عەجەم »ی بۆڕۆژنامەکەی هەڵبژاردبێ ، بەزۆریشی ڕق لەعەجەم بووبێ ۰ لێرەدا دەمەوێ ئەو نوکتە ڕووناك بکەمەوە کە کوردی ئێران بەتایبەتی خەڵکی موکریان ، کە گوتیان « عەجەم » مەبەستیان کاربەدەستانی دەوڵەتە نەك ڕەش‌و ڕووتی میللەت ۰ دوورنیە یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەکە « ڕۆژی کورد » بووبێ ، دوایە ناوی گۆڕی‌بێ‌و بووبێ بە «کورد» ۰

٢ ـ نووسەر بەرا شکاوی دەڵێ ڕیپۆرتاژی کوژرانی خالۆ قوربانی لە پاشکۆی فارسی ژمارە دووی ڕۆژنامەی «کورد» ڕاستەو خۆ نەقل‌کردوە ۰ لە ڕیپۆرتاژەکەدا نووسراوە شەڕی دەورەی شاری سابلاخ ڕۆژی ٢٩ی ڕەمەزان داکراوەو خالۆ قوربان لەو ڕۆژەدا کوژراوە ۰ هەروەها هەر لەو ڕیپۆرتاژەدا هاتوە کەیەکێك لە سەرکردەکانی شەڕی دەورەی سابلاخ (ئەمیر ئەسعەد) خۆی‌گەیاندۆتە شەڕی کێوی ئالبلاغ ۰ ڕێگای نێوان سابلاخ‌و ئالبلاغ بۆ لەشکر هیچ نەبێ دوو ڕۆژ دەبێ ، کەوابوو دیارە شەڕی کێوی ئالبلاغ لەڕۆژەکانی‌هەوەڵی مانگی شەوال‌دا ڕووی داوە ۰ بەینی ئالبلاغ‌و ورمێش بۆ پەیکی سوار چوار

رۆژ دەبێ • بۆیە وام لێک داوەتەوە کە ئەم ریپورتاژە بۆ رۆژی ٥ی شەوال نەکەیوەتە ورمێو لەژمارەی دووهەمدا کە بە حیسابی سەرەوەمان دەبێ لە ٥ی شەوالدا بلاو بووبێتەوە، چاپ نەکراوە• مەگەر وای دانێین کە لەنێوان سابلاغو ورمێدا خەتی تەلگراف بووبێو ئەم ریپۆرتاژە بەتەلگراف ناردرابێ ، کەئەویش جێی گومانە • یان پاشکۆیە کە لە پاشان چاپ کرابێ •

٣ ـ نەک هەر ئەو سەردەمی بەلکو بەداخەوە ئێستاش ئەم شوێنەماوە کە کورد سەرو بەندی جێژنان دەست لە رەشو سپی ناداو لێی ڕادەوەستێ بۆ پاش جێژن • مەگەر پێمان وابێ مەلا محەممەدی تورجانی زانا ئەم رۆژنامەی وەک جێژنانەیەکی بەنرخ پێشکەشی نەتەوەکەی کردبێ • **بەهەرحال پاش ئەم لێکدانانەوە دەتەینە ئەم راستی یە کە رۆژنامەی کوردی چاپی ورمێ لەئاخرو ئۆخری رەمەزان یان لەهەوەل رۆژەکانی شەوالی ١٣٤٠ی کۆچیدا بلاوبۆتەوە • بەلام جێی داخەکە نازانین چەند ژمارەی لێدەرچووەو چۆنو بۆچیو تەنگێ پەکی کەوتوە •**

لێکدانەوەی ئەو ناوانەی لەم باسەدا هاتوون :

**ئالبلاغ : گوندێکە لەنێوان سەقزو بۆکاندا •**
**ئەمیرئاباد : گوندێکە لەلای رۆژئاوای نیزیکی بۆکان •**
**ئەمیر ئەسعەد : عەلی ئاغای عەلیار سەرۆکی عەشیرەتی دیبۆکری•**
**ئەمیرو لعەشایر : قەرەنی ئاغای مامەش سەرۆکی عەشیرەتی مامەش •**
**ئیندرقاش : گوندێکی زۆر گەورەیە لە شیمالی شاری مەهاباد ،نیزیک بە فەخرەقا •**
**خالۆ قوربان : یەکێک لە کوردە ئازادیخوازەکانی گیلان بوو کە دەگەل کوچک خانی جەنگەلی لە راپەرینی جەنگەلدا هاوکاری دەکرد،دوایە بای داومو لای داو بوو بەپیاوی دەولەتی ئیران •**
**خەزایی : کێوێکە لە شیمالی شاری مەهاباد هەلکەوتوە •**
**داشا مەجید : تەپکێکە لە رۆژهەلاتی شاری مەهاباد •**
**دەرمان : گوندێکە لە رۆژهەلاتی شاری مەهاباد •**
**زاوا بووک : کێوێکی بەرزو سەختە لەرۆژ هەلاتی شاری مەهاباد •**
**سالار سەعید : عەلی بەگی حەیدەری برای شاعیری ناودار عەبدوللا بەگی (ئەدەب) •**
**سەرداری موکری : عەلیخان کوڕی محمد حسین خانی شەهید •**
**سوارەی ئەحمەدی کولاوی ئاغای : ئاغایەکی بەناوبانگی عەشیرەتی مەنگوڕ •**
**شاروێران : ناوچەیەکی گەورەو پڕپیتو بەرەکەتە لە دەوروبەری مەهاباد • کەلاوەکانی دریاز پاتەختی موکریان لەو ناوچەدایە •**
**«صاین قلعه» ساین قەلا : شارێکە لەبەری هەوشار •**
**فەیزوللا بەگی : عەشیرەتیکی بەناوبانگە کەوتۆتە نێوان سەقزو بۆکان•**
**لاچین : گوندێکە لەرۆژ هەلاتی نیزیکی مەهاباد[2] •**
**لاهووتی : شاعیری بەناوبانگو شۆڕشگێری ئیران •**
**هەمزاغا : برای قەرەنی ئاغای مامەش (ئەمیرو لعەشایر) •**

## سەرنج : نووسەر لەسەرتا سەری کتێبەکەیدا ، ناوی ( سمکۆ ) بە ( سمیتقۆ ) دەبا •

(١) کورد ـ رۆژنامەیەکی کوردی‌ی زمانی سمایل ئاغای سمکۆیە ، لە سالی ١٩٢١ لە شای (ورمێ) دەرچووە ، تەنها سێ چوار ژمارەی لێ دەرچو لەوەودا پەکی‌ـ کەوت •

لەمێژوی ئەدەبی کوردی ـ چاپی دووەم ـ لاپەرە (٦١١) بەیان •

(٢) مامۆستا هێمنی شاعیر لەم گوندەدا لەدایك بووە •

( بەیان )

## پاشماوەی



محمد أمین هەورامانی

**٢ ـ لێکۆڵینەوەی بەراوردی لە مۆرفۆلۆژی‌دا(٢) ٠**
لەم بەشەدا تەنها باسی هەندێ موفرەدات‌و چەند پێشبەند (Prefixes) و پاشبەندێك (Suffixes) دەکەین ٠

**ب ـ موفرەدات** (Vocabularies) (٣)

١ ـ Pād
گۆکەی (پاد)ە ، وە مانای (پا) بەزاری هەورامی ، وە (پێ) بە سۆرانی ئەدات ، وە ئەم ناوە ، واتا وشەی (پاد) لە ریزی ناوی (نێر) دایە ، هەر وەك ئێستەش لە زاری هەورامی‌دا وایە ٠

٢ ـ /āp/ :
گۆکەی (ئاپ)ە ، کە مانای (ئاو) بە سۆرانی وە ( ئاوی ) بە زاری هەورامی ئەدات ، ئەم ناوە لە ریزی ناوی (مێ) دایە ، بۆیە لە زاری هەورامیش‌دا دەنگی /ی/ یخراوەتە پاشکۆیەوە ، بۆ ئەوەی بە (مێ) بدرێتە قەڵەم(٤) ٠

٣ ـ /gāv/ :
ئەم وشەیە ، گۆکەی (گاف)ە ، کەمانای (گاف) یا خود (گاو)ی هەورامی ئەدات وە مانای (گا)ی سۆرانی ئەدات ٠

وشەی (گاف) لە ئاوێستادا بۆ نێریش‌و مێیش دەست ئەدات ، هەر وەك لە زاری هەورامیش‌دا وایە وەك ، لە دوورەوە (گا)یەك ببینی ، نەزانی (نێر)ە یا (مێ)یە ، دەڵێیت : ئەوە (گاو)ە ، یا (گاف)ە ٠ واتا (نێر)و (مێ)ت بە یەك شت داوە تە قەڵەم ٠

٤ ـ Barz :

**ئەم وشەیە ، گۆکەی (بەرز)ە ، وە لام وایە لە هەموو زارە کوردی‌یەکاندا ، ئەم وشەیە (بەرز) بەهەمان (واتا)و هەمان (گۆ) بەکار دەهێنرێت ، وە هەر وەك لە ئاوێستادا ، ئاوەڵناوە ، لەزارە کوردی‌یەکانیش‌دا وایە ٠**

٥ ـ Māh:
ئەمە ، گۆکەی (ماه)ە وە مانای (مانك) ئەدات ، وە تاوەکو سەرەتای چەرخی بیستەمیش شاعیرەکانمان زۆر گۆرانی‌یان هەڵداوە بەسەرمانگ‌دا ، وە بەهەمان (مانا)و (گۆ) وە ٠

٦ ـ Xšap:

ئەم وشەیە ، گۆکەی (خشەب)ە ، یاخود دەنگی /خ/ کەی لێ وە سواوەو بووە بە (شەب) لە فارسی‌دا ، یا جگە لەوەی کەدەنگی /خ/ کەی ، سواوە ، دەنگی /ب/ کەش

ئاڵۆ گۆڕی بە سەردا هاتوەو بووە بە دەنگی /و/ لەزارە کوردی‌یەکاندا وەك (شەو) ٠ ئەم ناوە ( شەو ) لەریزی ناوە (مێ)کان دراوەتە قەڵەم ، هەروەك لە هەورامیش‌را وایە ٠

٧ - Padā :

**ئەم وشەیە ، گۆکەی (پادار)ە ، بەلام دەنگی /ر/ کە زۆر شارراوەو کەم دەنگە ، ودووریش نی‌یە کە ئەم دەنگەی تازە بۆهاتبێ ٠ ئـــەم وشەیە بەکـار دەهێنرێت بـــۆ واتا دانی : ( خێرا رۆیشتن بەرێوەو توانای زۆر رۆیشتن بەرێوە ) ، ئیستەش بۆ هەمان (واتا) وە بـە هەمان ( گۆ ) ، هەمان وشە ، لە هەورامی‌دا بەکار دەهێنرێت ٠**

ئەوەی کەپێویستە دەربخرێت لەم وشـــەدا ، ئەوەیە کە دەنگی /د/ کـــە ، لەوەی سولەیمانی‌و هەورامانە ، لە وەی هەولێر نی‌یە ٠ (ە) واتا /د/ی کلۆر (ت٠ و) ٠

**ح ـ پاشبەند** (Suffixes)

١ ـ بۆ ناوی (نێر) ، پاشبە ندی /a/ بەکار هاتوە ، وەك وشەی ؛ (asp-a) ، کـــە گۆکەی (ئەسپە) واتا (ئەسپ) ٠

٢ ـ بۆ ناوی (مێ) پا شبەندی ā بەکار هاتوە ، وەك لە وشەی ...p-ā دایە ، کە گۆکەی (ئەسپا)یە ، وە واتای (ماین) دەدات، ئەمانەش نموونەن :

١ ـ dain-ā (٦)

ئـــەم وشەیە گۆکەی (دەینا)یە ، کە واتای (ئاین) ئەدات ؛ کەوا بوو ئەم وشەیە عارەبی نی‌یە ئاوێستی‌یە ، لێرەیش‌دا (دەینا) لە ریزی ناوی (مێ)دا سەر ژمێر کراوە ٠

٢ ـ /sur-ā/

ئەم وشەیە ، گۆکـــەی ( زۆرا )یە ، دەنگی /س/کەوەك دەنگی /ز/ بێ وایە ، وە مانای (زۆر) ئەدات وەئەمیش پاشبەندی ناوی(مێ)ی خراوەتە شوێن ٠

٣ ـ ئەمەش ، واتا /Ī/ ، جۆرە پاشـــبە ـ ندێکی ترەو بۆ (مێ) بەکار دەهێنرێت ، وەك: Bum-Ī کـــە گۆکەی (بومی)یە وە مانای (زەوی) ئەدات ، لە هەورامی‌دا ، هەمـــــان وشە ، بە هەمان واتا بەکار دەهێنرێت ٠

٤ ـ پاشبەندی بەراورد کردن :
(Comparative, Superlative)

**پاشبەندی** tdra (٧)

ئەم پاشبەندە گۆکەی (ترە)یا خود (تەرە)یە ، بۆ بەراود کردن بەکار هاتوە ، وە بەتایبەتی لـــە ئادەڵناودا وەك بڵێیت :

خراپ : خراپترە
aka-tra : **aka**

کە گۆکـــەی (ئەکە = ئەخە)وە (ئەکەترە = ئەخەترە) ئێستەش وشەی (کخە) بەکار دەهێنرێت ؛ بۆ (خراپ) یا (پیس) ٠

**د ـــ لێکۆڵینەوەی بەراوردی لە سینتاکسی‌دا :**

**لام وایە ، ئەمەیان ، ئاڵۆزاو ترین باســـە ، چونکە ، ئـــەو سەرچاوانەی ، کـــە ئێستە بەلای منەوەن‌و لـــەوەو پێش ( لەزنجیرەکانی پێشوودا ) ناومان هێنان ، روو بەئاینین ! (واتا هەر سروودو دۆعان ؛ بێ گومان سروودو دۆعـــای ئەوکاتە ، وە بەتایبـــەتی هی پێخامبـــــەر بێ ، یا بۆی هـــاتبێ ، ئەبێ جیاوازی هەبووبێ لە رووی بەهێزو پێزو پڕ واتایی‌یەوە ، لەگفتو گۆی ئاسایی ئەو سەردەمە ، وەئەگەر لەوەش بە گـــــومانی ورد بەرەوە لەزمانی عارەبی ( رادیۆ )و زمانی عارەبەکانی پاشـــــووڕی عـــــیراق ، یازاری ئەدەبی کـــوردی‌و زمانی هـــــەر لادی‌یەکی کوردی تر ، لەگـــەڵ جیاوازی‌یەکی زۆر زۆری ئێستاو ئەوستا وە لە هەموو روویە کەوە ) ، لەبەرئەوە رستەمان دەست نەکـــەوت کـــەلە ژیانی رۆژانەی ئەمرۆدا بەکار بهێنرێت ، جگە لە چـــەند رستەیێ نـــــەبێ ، واهەندێکیان ، لێرەدا بـــلاو دوکەینەوە : (٨)**

ورد بەرەوە لـــــەم رستانە ، بزانـــــە ئـــاڵۆ گۆڕەکە ، کە هاتوە بەسەر زمانی ئاوێستاو کوردی دا ، زۆر بوە یاکەم ، ئەگەر ئەو ماوە دوورو درێژە بهێنێە بەر چاوت :

١ - DA-D-MAHI : (٩)

ئەم رستەیە گۆکەی (دار مەیێ)یە ، وە واتای (پێم دا) ئەدات ، بە زاری (سۆرانی) وە (رام پەنە) بەزاری هەورامی‌و (من داڤێ) بەزاری بادینانی ٠

٢ - DA-DÁ-TJ

ئەم رستەیە ، گۆکەی بەم جۆرەیە ؛ (دە داتی) واتا (پێی دا) بەزاری سۆرانی ، (داش پەنە) بەزاری هەورامی ، وە (وی داڤێ) بەزاری بادینانی ٠

٣ - ZNA-TA

ئەمە گۆکەی (زنە تا)یە ، واتا (دەزێ)بە زاری سۆرانی و (مزۆ) بەزاری هەورامی وە (دێ زێت) بەزاری بادینانی ٠

٤ - ZI-ZAN

ئەم رستەیە گۆکەی ( زیزەن )ە ، کە واتای (زان) یاخود لە دایك بوون ئـــەدات لە سۆرانی‌دا وەبە هەورامی (زان)ە ، وەبە زاری بادینانیش هـــەر (زان)ە ٠

**پاشماوەی لە لاپەرە (٢٣)**

# نهێنەکەی دایکم

ع٠ بەسۆز

**پێش‌کەشە بەهــــەموو مرۆڤیک کەتا دلّیان بەجوری دلّی ئەم دایـکە هەتیو بارە لەخۆ بووردووە لێ بــداو هەستیان بۆ خزمەت یارزگار کردنی منـــالّو مال لّی‌تێک چووان تیا بجوولێتو بێتـە جۆشی بەتایبەتی ئەوانـــەی کەسەد ئەمەندەی ئەم دایکە بی‌دەرامەتە خـاوەن دەستو تواناو دەرامەتن ٠**

**لەکێلگەی بەکرەجۆ**

**ع٠ بەسۆز**

**گومانی نیە کەزۆرمان بیستوە منالّان دایکیان هەلّ بخەلەتێنن بەلاّم رێی تێ‌ناچێ دایکیک منالە ـ کانی خۆی هـــەلّ خەلەتێنێ ، کەچی من دایکێک ئەناسم ئەمەی کردبێ‌و لەدواییشدا دەربکەوێ بۆچ وای کردبێ ٠**

ئێمە لەماوەی گرانیەکی کوشندەدا بوو بووین وە گومانیش نیە لەوەی کەمنالاّنی ئەمرۆ لەوەنەگەن گرانی چیەو چۆنە ، رەنگە ئێمەش هەر ئەوەندەمان لێ زانیبێت کەبێ پێلاوی‌و خۆراکی هەرزان بەهای بەکـــــەم‌و کووری وەیان لانــــەو بانەیەکی بەش نەکردووی پڕ لەکوێرەوەری بێ جگـــەلە مەترسی ئەوەی کەم دەرامەتیش فرێمان بداتە سەر شۆسە ـ کان بۆ سوآل کردن ٠ ئا ئەمەبوو جـۆری سەختی باری ژیانمان وە ئەوەشی کەباری زۆرتر لەسەرشان گرانتر کردبوونی ئەوەبوو کـەباوکمان رۆیشتبوو دەستی لێ هەلگرتبووین ٠

**ئێمەش لەگـــەلّ گەورە بوونمانا رۆژ بەرۆژ زیاتر هەستمان بەلانەوازی کوشندەی خۆمان ئەکرد کەلە ژێرباری ئەم جۆرە گوزەرانو گرانیەدا ژنێک‌و چوار منالّ ئەبێ چیمان لەدەست بێ ؟**

هەر چەندە مامێکی پــیری باوکمان هــەبوو سەرگوزەشتەی لەم بارەی بوون‌و نەبوونیەوە بــۆ پەندو کەلــــک لێ وەرگرتن زۆر بۆئەگێراینەوە و بۆی ئەسەلماندین کەهیچ حالێک تاسەر وەک خۆی نا مێنێتەوەو هەولّی دلّ نیابیو باوەری بەگۆررانی کــاتو هـــات بەختی‌و دەستگیربوونی ژیانێکی فراوانتری لەگەلاّ ئەدایـن‌و دلّ خۆشـــی ئەدایەوەو وێنـــەی بۆ ئەهێنایەوە کـەفلاّن یافیسساری دیوە کەلەئێمە بێ دەرامەت‌ترو گرفتـەی خەمی قەرزاری بوون‌و ئەنجام بەسایەی سەبرو خۆ راهێنان بـــە خۆراگرتن لەژێرباری ستەم هەلّگری‌و کۆششیانەوە لەوخـــەم‌و پەژارەی رووتی‌و برسیەتیەیان رزگارو ئێستە هێندە لەتواناو تێرو پڕیدان دەستی یارمەتی بۆ داماوو هاو حالّی جارانی خۆیان درێژ ئەکەن ٠ بەلاّم ئێمەی منالّ گەرچی باوەرمان بە پێکهاتنی ئەو خەو وئاواتە نەبوو گوێی خومان هەربۆ شل ئەکردو بە ئاواتیەوە هەناسەمان هەلّ ئەکێشا کەچی دایکمان ئەم قسانەی پێ‌خۆش بوو وەلەچــاوو روویا دوور بینیەکمان تیا هەست ئەکرد ٠

**بەهەر کولەمەرگیەک بووبێ دایکمان لـــەو چەند سالەدا بەرگ‌و خواردن‌و جێگەو خوێندەواری بۆپێک هێنابووین بەخەم خۆریەکی واوە کەلەپێنا ـ ومانا سەری سپی‌کرد پێش ئەوەی بگاتە سی‌و پێنج سالەی تـــەمەنی ٠ دیکمان رووخۆش‌و هەمیشەدەم بەبزەبوو بەلاّم لـــە چاوەکانیا شێوەیەکی مەترسی هەبوو بۆیە جل‌و بەرگێکی جوان‌و کاتێکی شـــادی هەرگیز بەخۆ یەوە نەدی لەسەر ئەم هەموو حالاّنە شا ئێمەی کەچوار برابووین گەورە کردوو پێ‌گەیاند تابۆپەیاکردن‌و وەدەست هێنانی ژیانی باشتر لێی جیابووینەوەو توانیشمان کـــەلە دەست کەوتمانا پارەیەکی ئەوتۆ پاشەکەوت بکەین‌و هەموو هەفتە ـ یەکیش بـــۆی بنێرین بەئومیدی ئەوەی کە رۆژانی رەشی نەبوونی بۆ لەمەودوای پاش پەنجا سالّی پێ بگوزێنە سەر خۆشیانی‌و پشوو کەچی لەباتی ئەمە هەستمان بەپێچەوانەی کرد چونکە لەباتی ئەوەی کەباری سووکترو ژیانی باشتربێ کەچی گرانترو خراپتر بووەبوو** چونکە هێشتا لەومالـــە تەنگەبەرە نەی‌گواستبووەوە شوێنێکی باش‌و فراوانتر گوایە هەر ئێرەی لەلا دلگیرترە وەیان نەی‌کردبوو یاریدە

دەریک بۆخۆی رابگرێو نەختێک بحەسێتەوە تـا ئەنانەت جلو بەرگو متومووروبەکی جوانی بۆخۆی نەکریبوو وە هیـــچ خۆشیەکو لەزەتیکی دنیایی بۆخۆی پێک نەهێنابوو وە هـــەر وەها بەشێوەی ناهەمواری جاران بووە ، تالەسەردانیشمانا هـــەر تەگبیرێکی سەیرانو چوونە بلاجو قەراخ دەریایە ـ کیشمان بۆ پشوودان یا چوونە دەرەوە یە کیشمان بۆدنیا بینینو خەم بەبا دانیکدا لەگـــەڵ بکرادیـە بەبرِوبیانوو پێی دوا ئەخستین ئێمەش بەبێ ئەوەی کەلەم رەوشتەی کەلەخۆی ناوە بکۆڵینەوەو لـــەم نەهینیەی بگەین لەپارەو مووچە بۆ ناردینا بەردەوام بووینو هەرچوارمان واچـــوە دڵمانەوە کەدایکمان کارامەو دینا دیدەتر بووەو گومانی نیە کەئەم پارەی بیست ساڵەی لای خۆی بۆ ئێمە گلداوەتەوەو بۆی پاشەکەوت کـــردووینو دیارە لـەدوای مردنیشی هەمووی هـــەر بۆ ئێمە بەجێ ئەمێنێ بام ئێمەش لەودەوری محتاجیە شانەما بین ٠

کەچی بەپێچەوانەی ئـــەم لێک دانەوەیەمان **کەناو شتوومەکەکانی گەراین وامان بۆساغ بووەوە کەدایکمان هەر بێمایەو بەنابووتیش مردوە ! چۆنو ئەی گوایە ئەم هەموو چەکانەی کە گۆوریوەتەوەو پارەکانی وەرگرتووەو هەمووشـــی خەرج کردوەو هیچیشی لە پاش بەجێ نەمابێ ئەی چی لێکردوەو بەچی داون ؟ سەرمان لەمە زۆر سوورماو فیکرمان بۆشتی دوور چوو کەدایکمان لەژیانیـــا کردبێتیو لەئێمەشی شاردبێتەوە بەڵام بەم جۆرەش نەبوبوو ئایا راستیەکەی ئەزانن کـەچی کردبوو ؟ ئا ئەمە بوو نەهێنیەکەی لەژیانیاو دوای خۆی ئاشکرا بوو ٠**

**دایکمان بەنـەهێنیو پاش ئەوەش کەئەرکمان بەسەرشانیەوە نەما لەگەڵ ( کـۆمەڵی پەناداریەتی دەربەدران دا ریک کەوتبوو کەچوار هەتیوی لـە هەتیو خراوانی شەری جیهانگیری ئەوروپای بۆبنێرن بۆ پەروەردەو گەورەکردنیان ، لەتەنیشت خۆیەوە خانووی بۆ بەکـــرێ گرتبوون وە هەمووخزمەتو ئاگـــاداریو فێرکردنو مشووری تەندروســتیانی خستبووە نەستۆی خۆیەوەو بەدرێژایی ئەم بیست ساڵەو دەوری رەبەنی ـ مراهەقە ـ ی سەربەچەڵەمە وکۆسپدا وە ژنیشی بۆ دوانیان هێنابوو ٠**

سەیر لەوەدا بوو کەبۆچی ئێمەی لەم کارەی ئاگادار نەکردبوو وەراستی ئەم چوار کورە تازەیەی تری لا دەر نەخستبووین ، وابزانم ئەمەشی بۆیە وا لەئێمە شاردبۆوە کەنەکوو ئێمە رازی نەبین بەوەی کە خۆی ماوەیەکیتر لەم تەمەنەشیا دووبارە ماندوو بکاتەوە ؛ **کەوابوو راستە کەدایک هەمیشە هەر ـ دایکەو جگەر سۆزە بۆ منالو کورپەی هەموانو ئەم سۆزەشیان خلیقەتێکی سروشتی خواییە لەدلو دەروونیانا وە ئەمە ئەوەش ئەگەیەنێ کە باوەرکردن بەوەی دایک کە ھەموو ئیسراحەتی زۆربەی ژیانی خۆی تەرخان بکات بۆ پەروەردەو کامەرانی جگەر ـ گۆشەی بەرەنگارکردنی ئەم سروشتەی بۆ بەستنو چارەی سۆزی دایکایەتی شتیکی هەروا ئاسان نیە٠**

بەراستی مامە پیرەکەمان راستی ووت کەدووای هـــەموو ئەنگانیەک فراوانیە وە ئـــەوەبوو دوای ئەوهەموو تەنگیو چەڵەمەی رووتیو برسیەتیە بـە ئاواتی حەسانەوەو ژیانی خۆشتر گەیشتینو وەک وا بەخۆمانەوە دی باوەرکردن بـــە خۆ وەدەست گرتن بەدەسکی کۆششو چمکی دڵنیایی بەهـــاتی بەختیاریەوە لە سوود لێوەرگرتن بەو لاوە زیانیک نابەخشێ وەک لەوورەبەردانو هیوا لەخۆ دامردناو لەتەمەڵیا تووشی مرۆڤ ئەبێ ٠

سەد خۆزگە لەهەموو شوێنیکی جیهاندا کەپرە لەهەمە چەشنە رەگەزی ئادەمزاد وجـۆری ئیدارەو بەتایبەتی ئـــەو شوێنانەی کەبەدکاری رۆژگارو ناهەمواری دەستی ناپەسندی شەرو شۆرو ئاژاوەی تیا ئەگێرێ وەیا جۆرە فەلاکەتو بەڵایەکی ئاسمانی یازەمینی تیـــا دەرئەخا کەلەپایا هەزاران لانەوازو دەربەدەر وهەتیوو هەتیو بارانو سەر ومال لەکیسی چووانی تیاروبداو بەسەر لێشێواوی کـــۆچ بکاو ویلی شوێنانیان بکا وەک لە زۆر شوێنانی تــردا هەن ، لەم شێوەی دایکە دایکان ، باوکان ، جگەر ـ سوزانی تر برە خسانایە بودالەی ئەوجۆرە منالو مالەلێ قەوماوانە خۆ ئەگەر بەچەشنی بەخێوکردنی ئەو دایکە خاوەن چوارمنالەش وەک جگەر نەخرینە ژێـــربالێ ئەستۆ لەوانەی کەسروشت لەزینـەتی وەچەی بێ بەش کردوون وەیان بۆ مەبەستی تری **ماقوول بەنیازی پاکی مرۆڤایەتیەوە لە وڵاتی ئێمەدا دڵسۆزانی وا هەڵکەون بۆ گرتنە خۆی منالێ یـا پەراگەندەیەک ئەمە شەریفانە ترین رێگەی ئادە ـ میزادیە کە زیندو کردنەوەو لەناونە چوونی منالو خیزانی دەربەدەری تیا بەدیەت وە ئەوەی کەلەپێش چاوی هەموانە ئەوەیە کەلەو شێوەی چوار هەتیوە ئەوروپاییە زۆرو زەبەندە هەیەو هەروها وە نەبێ هـەموو کەسێکیش بەتایبەتی ئەوانەی کەچەپۆکی ئەو حالو پەشێویەیان بەرنەکەوتووەو یادوو لەبەلا ئەمێننەوەو ئەپارێزرێن خۆ وەنەبێ هەموویان وەک ئەو دایکە وادەستکورتو بێدەرامەتو نەتەوان بن کەئەو لەسەر ئەم حالانەشیا چوار هەتیو ـ کەئەمە هەر بەدەم وائاسانە ـ لەنەتەوەکانی تری بێگانەو دوور وڵاتی نـــەدیوو نەناسـیوی بـە خێوکـردو پێگەیاند ٠**

لەگوڤاریکی ـ المختار
بەدەست کاریو زیادکردنەوە وەرگێراوە

گۆشەی

# لێکۆڵینەوە لە کتێبی کوردی

## کوردەواری

نەریمان

**دوا کتێبی مامۆستا علاءالدین سجادی‌یە کەبریتی‌یە لە چوار سەد لاپەڕەو لەسەر کاغەزی هەشتاغرامی سپی‌و بەقەوارەی٨ر٢٣ × ١٧ × ٢سم٣ لە ساڵی ١٩٧٤ی زاینی ، چاپی یەکەمی بە هەزار ژمارە لە چاپخانەی (مەعاریف) لەبەغدا چاپکراوەو بەتەجلیدێکی باش‌و بەخەتی زێرین ناونیشانی لەسەر نوسراوە ٠**

لە هەفتەیەکداو لەسەرخۆ پەڕە پەڕە بەوردی سەراپام خوێندەوە پاش ئەوە بەپێویستم زانی ئەم لێکۆڵینەوەی لەسەر بنووسم تاوەکو خوێنەری بەرێز لە سوودو کەڵکی ئەو کتێبە بگەن ٠

« واری » لە وارەوە هاتوە واتە « رەوشت‌و عادەت » ئەمیش لەبنچینەدا ئەچێتەوە سەر « شوێنەوار ــ شوێن هەوار »وە لەناوماندا باوە ئەووتری « وارو یۆخم لەسەر دانا » یەعنی ئەوی هەمبوو لەسەر ئەو شتەم دانا هەر چەندە خزمایەتیەکی زمانی تەواو لەنێوان ئەم وارەوە واری تورکیدا هەیە بەڵام هەردوو بۆ یەك مەبەستیش بەکار ئەهێنرێن ٠

**میللەتانی زیندوو « وارە »کانی خۆیانیان زیندووکردوتەو لەسەریان لوسیوەو لەفەوتاندن پاراستویانەو لە قالبێکی نوێدا ئەو رەوشتو نەریتانەیان لەسەر شانۆ نواندوەو بۆجل‌و بەرگ مۆزەخانەیان درۆست‌کردوەو یاری‌یەکانیشیان بەدەست کاری‌یەوە خستوەتە بارێکی نوێدا ، لە سینەماو تەلەفزیۆن ئەبینین میللەتان شانازی بە بەرگ‌و نەریتی خۆبانەوە ئەکەن‌و ئەیانپارێزن ، لەم بارەیە بۆشکین ئەڵێ « رێزگرتنی کۆن ، رۆشنبیری لە دورندێتی جیا ئەکاتەوە » یەکێتی‌ی سۆڤیات زۆر گرنگی بە لەناو نەچوونی ئەم کەلەپوورانە داوە بەم هۆیەشەوە نووسەرانی کوردی ئەوناوچەیەمان دەستێکی دوێژیان ئەم مەیدانەدا هەیە ٠**

کورد وەکو گەلانی جیهان خاوەن « وار »ێکی هێجگار دەوڵەمەندە بەڵام نوسەرانی ئەم ناوچەیانەمان ئەرکی کۆکردنەوەیان فەرامۆش کردوە وەك مامۆستا علاءالدین لەسەرەتای کتێبەکەیدا ئەفەرموێ « **خزمەتی‌خۆی کەم‌کردوە ، هەر بەرهەمێکی هەبوە بەدەستەگوڵێك‌و وبەبۆن‌و بوونەوە داویە بەیەکێکی‌ـ تر و خۆیشی سەیرکردنی بۆ نەماوەتەوە ٠٠٠** » لەم چەند ساڵانەی دوایی‌یەدا هەندێك لەنوسەرانی بەرێزمان قۆڵیان لێ هەڵماڵیوە لەپەندی‌پێشینان‌و فۆلکلۆرو یاری‌و گۆرانی‌و جل‌وبەرگ‌و داستان‌و شتی‌کەیان کۆکردوەتەوە بەڵام هێشتا بەپوختی وەك ئەم بەرهەمەی مامۆستا نەخراوەتە بەردەست ، بەمە مامۆستا سجادی جارێکی‌تر گۆی هونەری بردوەتەوە، **ئەم مامۆستایەمان یەکێکە لەو دڵسۆزانەی کەنزیکەی چل ساڵە خۆی بۆ بوژاندنەوەی رۆشنبیری کوردی تەرخان کردوە ، لە کونجی مزگەوتێکی بچکۆلانەدا بەتاقی تەنها لەناوەندی پشووی نوێژەکاندا خەریکی موتالاو نوسینەوەیە دەساڵی رەبەق ١٩٣٩ـ١٩٤٩ گۆڤاری گەلاوێژی بڵاوکردوەتەوە پاش ئاوابوونی ئەو ئەستێرە گەشە دەستی کردوە بە بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی خۆی لەساڵی ١٩٥١ یەکەمین کتێبی (ناوی کوردی) ئنجا دووەم کتێبی (مێژوی ئەدەبی کوردی) لەچاپداوە دوا بەدوای ئەمەدا گەشتەکەوی‌و پێنج جزەی ( رشتەی مرواری )و ( شۆرشەکان )و (نرخ شناسی)و لە ساڵی رابوردوو دووبارە (مێژوی ئەدەبی کوردی) بەزیادەوە چاپ کردوە وا ئەم ساڵیشی بێ‌بەرهەم نەهێشتو کتێبی (کوردواری) بڵاوکردوە ٠**

**بەرهەمەکانی مامۆستا علاءالدین یەك لە یەك بەسودترن بەتایبەتی ( مێژوی ئەدەب ) و (نرخ شناسی)و ئەم (کوردواری)یە سێ پەڕاوی بەکەڵکن کەسێ کەلەبەریان پڕکردوەتەوە هەریەکەیان تامو بەرامی خۆی هەیە ناتوانین ئەمیان بەسەر ئەویاندا پەسەند بکەین وەك لەکوردێك ئەیرسن « خورمات خۆش ئەوێت یا ( مێوژ ) کابرا شیرین چێژبوە وهەردوکیانی بەدڵبوە ناچار وتوویەتی (خور مژ) ٠**

**ئەوی مامۆستا علاءالدینی ناسیبێتو بەوردی بەرهەمەکانی خوێندبێتەوە ، لەژیانو بەرهەمەکانیدا چەند دروشمێكو ئامانجێکی ئەکەوێتە بەرچاو وەك :**

١ ــ **ئەمانەتی عیلمیو ئەدەبی : مامۆستا لەنوسین و گێرانەوەی باسەکانیدا پەنجەی بۆ هەموو ئەو سەرچاوانە درێژ کردوە کە سوودی لێ وەرگرتوە وەناوی ئەوکەسانەی بەستایشو سوپاسەوە هێناوە کەپەندێك یا قسەیەکی خۆش یاچەند وشەیکی لێ دەست کەوتوە ٠**

٢ ــ وەفا : مامۆستا گولاوی وەفا دەپەرژێنێتە سەر ئەوکەسەی ناسیاوی لەگەڵدا هەبێت نەك تەنها لەژیانی ئەوکەسە لێی ئەپرسێتەوە بەلکو وەك شاعیرێکمان ئەڵێ (فیدای وەفاتم ا: پاش وەفاتم) ئەمیش جگە لەژیانی ئەو بلاوکردنەوەی هاورییەی بەلکو پاش وەفاتی ئەو کەسە وەفای لەگەڵ نابرێت ، چەند بەرهەمێکی وەکو (یادی ئەمین زەکی بەگ) و (پیرەمێرد)ی نیشانەیەکن بۆ ئەمە، لەم کتێبەشدا ئەو پەری وەفای نواندە کە باسی (راو)ی لەدۆستێکی وەرگرتوەو لەم دواییەدا ئەو کۆچی دواییکرد بەلام ئەم هەرکە ئەوباسە تەواو ئەکا لەلاپەرە ٣٠٨دا ئەڵێ : **( حەسەن بەگ ! ــ مەبەستی حەسەن فهمی جافە ــ منو تۆ دۆست بوین ماوەی سی ساڵ پێمان لە یەك نەبڕی ئێستە مردن پێی تۆی لەمن بڕی بەلام خەمت نەبێ من پێت لێنابرم هەر دێم بۆلاتو بەیەك شاد ئەبینەوە )**

٣ ــ وردبینی : لەهەموو نوسینەکانیدا مامۆستا زۆر لەشت ئەکۆلێتەوەو ئەچێتە بنجو بناوانی دەریای لێکۆلینەوەدا تا بە پوختی گەنجینەیەکمان بۆ دەست بخات ، ئەمە وای لەبەرهەمەکانی کردوە ببنە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو ٠

٤ ــ نوێ کردنەوەو دەست پێش خەری : مامۆستا باوەڕی بەنوێ کردنەوە هەیە هەروەها لەگەڵ گۆڕیندایە رەنگە دەساڵ لەمەو پێش باوەری بەشتێك هەبوو بێت کەبۆی دەرکەوت **ئەو شتە وانەبوە نەرمەوە ئەبێتو دەست ــ کاری لەو بیروڕایەی ئەوسای ئەکات وەك دووجار لەچاپدانی مێژوو بەزیادەوە هەندی** گۆرینەوە هەروەها دەست پێشخەرە لە مەیدانی نوسیندا وەك لەپێشدا دەرمان بڕێ بەبەرهەمی ئەوتۆ چارەسەری هەندێ شتی ــ کردوە کە کەس وابۆی نەچوە ، شاعیرانی وەکو (خانی) و (جەزیری) و (مەولەوی) بۆ یەکەم جار بەخوێنەران بەم شێوە نایابە ناساندوە ٠

٥ ــ کۆڵ نەدان : هەندێك لە نووسەرانمان بەدڵ و یستویانە زنجیرەیەك نوسینەوە بلاوبکەنەوە هاتوون پێشەکی جاڕیان بۆداوە کەچی نەیان بردوەتە سەرو زنجیرەکەیان پساوە ، ئەم مامۆستایە جاڕ نادات و بەرهەم لەسەر بەرهەم بە بێدەنگیو لە خۆبوردن بلاو ئەکاتەوەو هێشتا وەك جاخیجاران هەر چالاکیشەو خوێنی گەرمتر ئەبێتەوە ، لە گەلاوێژدا هەر خۆی بەرێوە بەر ، نوسەر ، ژمێربار ، مصحح ، جێبەجێگەر ، دابەش کەرو ئەرکی تریشی بەسەر شانەوە بوو کەئێستا بەدەکەس لەهەر گۆڤارو رۆژنامەکاندا ئەو ئەرکانە جێ بەجێ ئەکەنو هیچێك لەمانەش ناگەنە ئەو « گەلاوێژە »ی ئەو ٠

**ئا ئەمانە چەند هێلێکی سەرەکین لە ژیانو بەرهەمەکانی مامۆستادا لەبەر چاونو پێویستە نوسەرانی ئازیزمان کەڵکی لێ وەرگرن ، سەررای ئەوا نەش مامۆستا ئاشنایەتی قەڵەمو کاغەزو کتێبو مزگەوت پەسەندئەکاتە سەر چوونەناو کۆمەلانو یانەکانو شوێنی جانجال ، بەکورتی باوەڕی بەکردەوە هەیە نەك بە قسە ٠**

ئنجا لە روناکی ئەم تیشکانەوە با بابدەینەوە سەر «ئەسڵی مەبەست»و بزانین مەبەستی مامۆستامان لەدانانی (کوردواری) چی بوە ؟ لەسەرەتای کتێبەکەدا دەریبریوە ئەڵێ **(من بەو ناوەوە کەخۆم** یەکێك لەوان ئەزانم ــ واتەلەکورد ــ ماوەیەکی **لەمێژ بوو لەسەر ئەو خولیایە بووم کەلە روی رەوشتو ئەو شتانەوە کەکورد هۆگرین ، لەبەر ئەوە کەتەنگی زەوی هاتوەتە یەکو لەوانەیە بە هۆی لێك نزیك بونەوەی هەموو جۆرە مەردمێك لەیەکو بەتایبەتی لە کوردی سەر لێشێواو ئەو رەوشتانە بەرە بەرە لەناو بچن ٠٠٠ )**

بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزە مامۆستا لەچوار سەد **لاپەرەدا لەزەماوەنو شینو گوێزەبانەو جەژنو** نەورۆزو سەیران ئەدوێتو نەریتی کوردەواری لە جلوبەرگو کۆچو بازو راوو شکار پیشان ئەدات

**هەروەها لە هەندێ پیشـــە سازیکورد وەك کلاش چنـــینو نالبەندیو کورتان دروون ئەدوێت ئنجا لەسەرژیانی فەقێو فەقیتی دای ئەکوتیو بەدرێژی** لەهەموو لقو پۆپی ئەو جۆرە خوێندنە ئەدوێت کە سەدەها پیاوی بەرێزو نوسەرو پێشەوای کوردمان لەدەرچوانی ئەو تونابخانە بوون خوێندنی ئەوسای **مزگەوت وەك مامۆستا لەلاپەرە (٩٢) دەری بریوە ( بۆ خوێندن بوە نەك بۆ ئامانجی تایبەتیو گەورەیی دنیا ) ئـــەم جۆرە خوێندنە پێویستی بە لەســەر** نوسینێکی دورو درێژو قوڵو فراوان هەیەو هەروەها ئەبێ بەراوردی بکرێت لەگەڵ خوێندنی ئەم کاتەشدا، ئەمە زیاتر ئەکەوێتە ئەستۆی ئـــەو مامۆستایانەی کەشارەزای یان لـــە هەردوو جۆرەکـە هـــەیە • لەدواییدا باسی ئەو یارییانە ئەکات کـە تاماوەیەك لەمەو پێش لەناو مانـــدا باوبوون وەئیستا بەرەو لەناو چوون ئەچن •

هەندێك لەو باسانەی مامۆستامان لەســەری نوسیون ــ هەرچەندە هێشتا هەر سەرەتایەکە وەیا بناغەیەکە بۆنایندەمان ــ بۆ ئەوە ئەشێن کە چیرۆك **نووسانمان لە بەرگێکی تەمسیلی لەسەر شانۆکانماندا بینوێنن وەك یاری میروگزیرو پاشا پاشاو سەیرانو رابواردنی ئێواران هتد ••• بەمە ئـــەو نەریتانە** لەبەرگێکی نوێدا پێشکەش ئەکرێتو بەمە نەك هەر خۆمان لەخۆمان ئەگەین بەڵکو بیگانەکانیش لەکەلە ــ پورمان شارەزایی پەیدا ئەکەن •

**مامۆســـتا ســجادی وەك لەسەرەوە باســمان کرد لەم بەر هەمەشدا زۆر بەوردی لەباسەکان دواوە** لەرەگو ریشەوە بۆی هەڵکشاوە تا دەگاتە لـــقو پۆپی ئەوباسە ، لە لاپەرە ــ ٢٧٢ ــ کەلە ئەسبابی **تەون ئەدوێ هەموو کەرەستەکانی ئەخاتە بەردەستت** وەکو :

( دار ، لادار ، بالادار ، داروپرد ، فـرێت ، کورد ، تان ، پۆ ) گـــۆزەو دێزەو وردینەکانیشی ئەخاتە بەردەستت **( گۆزەلە ، نیمەسەوە ، گۆزە ، هالوە )** خـــۆ کەرەستەی جووتت وا بۆ ناوئەبات **ئەڵێ ئەمە هەرلەناو جوتیاردا ئـــەم ریشـــەی سپی کردوە نەك لەمزکەوتداوە کەرەستەکانی جوتت وا** بۆ ئەژمێرریت **( نیلە ، کەلەمە ، وێـــژە ، مژان ، هەوجار ، زمانە ، هەپە ، بەرووڵە ، دەستەدوو )** هەروەها کە ئەچێتە ناو ئاشەوە وەك باراش هارێك یا ئاشەوانێکی لێیەت کەنانیکی گەرمیان لەگـــەڵ ئەخوا ئەڵێ بەخوا (بەلە زەتە ••• ) کـــە چاکەی هەڵقوران ئەڵێتەوە ( هەر زۆر بەلە زەتە ) خەوی ناوئاشیشی لەوان بەلەزەت تر ئەداتە قەڵەم ، واتە لە نوسیندا چوەتە پێستی ئەوشوێنو شتەوە بەمە زیاتر سەرکەوتووە •

مامۆستامان ئەو بەرهەمەی لەقالبێکی سادەو رەوان دەربریوە وە جـــار بەجار تەعبیری ئەدەبی ئەوتۆی بەکار هێنـــاوە کتومت ئەڵێ گـــۆرانەو بەپەخشان وەسف دەکات وەیا مەولەوییەو پەخشان دەنوسێت ، فەرموو کەباسی ژیانی کۆچەریت بـــۆ ئەگێرێتەوە لە لاپەرە (١٤٨) دا ئەڵێت :

**( ئەگـــەر لەدورەوە چـــاوت بەو رەشماڵانە بکەوێ کەلەو بنارەداو لەناو ئەو مێرگو کولانەدا هەڵیان داوە هیچیترت بەدلا نایەت تەنهـــا ئەوە نەبێ کەئەڵێ ئەمانە خاڵی ســـەر گۆنای یارن لـــەو دەشتەدا گەمە ئەکەن )** وابزانم ئـــەم تەشبیهەی سجادی لەتشبیهی ئـــەم شاعیرەمان کەمتر نیـــە کەئەڵێ :

مێشی خاڵت نافڕێ بەس باوەشێنیکە بەناز :
چونکە پابەنـــدە بەشەهدی رومەتی زێباتەوە

هەروەها لـــە لاپەرە (٢٦٢) لە باســـی (کەژاوە)دا ئەفەرموێ : **(دەنگی زرەنگەی زەنگو دیمەنی شەکە شەکی پەردەی چوار دەوری کەژاوەکە هەر لەدورەوە مەردمی کێش ئەکـــرد بۆ سەیرکردنو زاخـــاوی مێشك ••• )** ئەم وەسفو تەشبیهانە لەو کەسەوە دورنیە کـــە تەمەنی لەنوسینی خانیو جـەزیریو پیر مێردو گۆراندا رابوردوەو چل ساڵە قەڵەمی لە دەست بەرنەداوە •

لـــەبەر ئـــەوەی باسەکەمان مەوزوعی بێتو بەفراوانی بروانینە هەموو بەرهەمێك پێویستە لە هەموو سەرێکەوە لێی ورد بینـــەوە ، بەتەواوەتی هەڵی سەنگینینو ئنجـــا نرخی بدەینی ، ئـــەوی لەسەرەوە دەرمان بڕی ئەولایەیە کە خستمانە روو ، ئنجا لە سەرێکی ترەوە بۆی ئەچینو ئەڵیەین ، ئایا کتێبی ( کوردواری ) بێ هەڵـــەیە ؟ زۆر پوختو تەواوە هیچ کەلێنێکي تیادا نەماوە ؟

ئەگەر مامۆستا لێم ببورێ ئەم تێبینییانەی خوارەوە ئەنووسمو ئەوەش ئەڵێم کەئەمە لە نرخی کتێبەکەی کەم ناکاتەوە :

**١ ــ دابەش کـــردنی باسەکانی کتێبەکە هەندێ کەلێنو پچرێ تیادا هەست ئەکـــرێ چونکە کتێبی وا بەنرخ دەبا بکرایەتە چوار پێنـــج باســی ســەرەکی ( باب ) یەوە ئنجا هـــەر بابێکیشی بە چـــەند فەسلێگـەوە ، وەك • ( أ ) ژیانی کۆمەلایەتی کورد (ب) ژیانی لادێ (پ) خوێندن لەکوردستاندا ، فەقێو فەقێتی (ت) پێشە ســـازی لـــە کوردستاندا (ج) یارییەکانی کورد •**

ئنجا لەهەر باسیکەوە لق و پۆپی جیاوازی لێ ئەبوەوە ماموستا وا دیارە دزەنگ هەستی بەمە کردوە بۆیە (یاری یەکانی) جیاکردووتەوە کەچی لەم لاوە لەبیری چوە چەندیاری یەکی پێشەکی نوسیوەو لەدەستی دەرچوە وەك ( چەڵەمەشکێنی • شەرەگەرەك • چراخان • بووکە بەبارانی ) ئەمانە هەموو یارین و ئاوارەی کردوون •

**٢ ـ لەمێژووی ئەدەبی کوردی و لەم کتێبەشدا لە زۆر شوێندا لە جیاتیِ وشەی (کوردستان) یا ولاتی کوردەواری وەیا شوێنی کوردەواری بەکار ئەهێنێت ، هەرچەندە فراوانیەك لەم دوو ووشە یەشدا هەبێت بەلام جێ و شوێنی کوردستان ناگرنەوە •**

٣ ـ بیری منداڵی زۆرتیژە ئەوی لە منداڵیدا بەرچاومان کەوتوە لەبیرەوە ناچن ، مەڵبەندو بێشکەی ئەو تەمەنەش لەوە خۆشترە ، بەلام کوردستان لە ولاتی ئەردەلان و موکریان فراوانترە چونکە کتێبەکە ( کوردوار )ی یە ، ئەبێت رەوشت و نەریتی کوردستانی فراوانی تیادا بێت ، ماموستا خۆی لە هەموو سوچیکی ولات دۆستی هەیەو لەم چەند ساڵانەدا ئەیتوانی رەوشتی کوردەکانی کوردستانی تورکیاو سوریا و کوردی سوڤیاتی بخستایە سەر کەچی لەچوار چیوەیەکی تەسك تاسا ـ ندویەتی نەك باسێکی هەمو کوردستانی ئەم دیو بەڵکو لورستانی ئەو دیویش بەجارێ پشتگوێ خراوە •

٤ ـ کتێبی وابەنرخ پێویستی بە وێنەو نەخشەی روون کردنەوە **هەیە کە باسی کەرەستەی جووت وەیا تەون وە یا هەر یاری یەك ئەکرێ ئەگەر نەخشەی ئەو شتە بکیشرایە زیاتر خەلق لێی ئەگەیشت ، ئەمە شتێکی ئەوتۆ گران نیە کە ماموستا بۆ ئەوەی بەخەڵقی ، گەیەنیت (کلاو) چیە لە لاپەرە (١٢٨)دا بەدەستیەوە دائەمێنیت و ئەڵێ ( تۆ بێنە بەرچاوت بێژنگێ دابنێ و بچوکی بکەرەوەو کونەکانیشی لابە چ وێنەیەك بەرچاو ئەکەوێ ئەوە کلاوە ) لە جیاتی ئەم خەیاڵە نارموایە بۆ ( کلاو )یکی زۆرو زەبەندە پیشاندانی وێنەی کلاویکی گرێ چن زەحمەت نیە ، خۆ بۆشایی زۆریش لە کتێبەکەدا هەیە بەم وێنانە پڕ ئەکرانەوە . وابزانم هونەرمەندی ئەو تۆشمان هەیە کە لە قسەی ماموستا دەرنەچن •**

٥ ـ لەکاتێکدا ماموستامان هەندێ ووشەی دور سێ جار لێك داوەتەوەو بایەخێکی زۆری پێ داون وەك وشەی (تەرو وشك) کە لە لاپەرە (٢٤٠)دا ئەڵێت (هەرچەندە باسی تەڕو وشك کرا بەلام بۆزیادە ئاگاداری دیسان باسی ئەکەینەوە ) کەچی هەندی وشەی گرنگ کەوتوەتە ناوەوە بەلایاندا تێ پەری کردوەو رەنگە زوربەی خوێنەران لە مەبەستی ئەو وشانە نەگەن وەك (دەو ، کەلێن ، تەراتێن ، پشك ، پیچەڵ ، قەواڵە ، دەقنە ، مەسدەر ، کەتیرە ) •

٦ ـ لەهەندێ شوێندا ماموسا سەری بۆ هەڵەی بلاوکراوە ( خطأ شائع ) دانواندوە وەك پاش وشەی (چاوش) کتوپڕ (لۆتی) لە گەڵ جووت کردوە ، چاوەش ، دەهۆڵ وەیا زۆر نا ژەنە ( لۆتی ) لە ( لوطی )یەوە هاتوە وشەییکە مەعنایەکی سووکی هەیە ، نابێ ئێمە پێ و شوێنی نەزان هەڵکەین (لۆتی) بکەینە **(پاشکۆ)ی چاوشی هەژار •**

**٧ ـ هەر نووسەرێك دەربارەی نەتەوەی خۆی شت** بنوسێت و دەربارەی بدوێ ئەبێ بڵێ (ئێمەی **کورد) وئەگەر هاتوو لەقەومێکی دیکە دوا ئەلی** (تورکەکان ، عەرەبەکان ، رووسەکان) واتە پیشانی ئەدا خۆی لەوان نیە ، ماموستامان کە باسی کورد ئەکاو لە کورد ئەدوێ زیاتر وشەی (کوردەکان) بەکار ئەهێنێت وابزانم ئەمە لەجێی خۆیدا نیە •

**٨ ـ ماموستا چوار لاپەرەی بۆ ژبانی (هەجیج) تەرخان کردومو زۆر بەریزەوە ناویان ئەهێنی و ئەڵێ (هەجیجی هیچ فروفێڵ نازانن ، درۆ ناکەن ، سوێند ناخۆن ) رەنگە لە منداڵیدا ماموستامان چەند هەجیجی یەکی وای ناسیوە، شەرت نیە هەمویان وابن ، چەم بێ چەقەڵ نابێ ، شێخ رەزای تاڵەبانی پێش سەد ساڵ هەجیجیمان وا پێ ئەناسێنی :**

**ئەم دەغڵە تەسلیمی ئەکا شێخ بە هەجیج :**
**نوقسانی ئەکا هەر لە تەغازێ دەکەویج**
**هەر بەمەشەوە ناوەستێ لە دوایی یەدا ئەو هەجیجە قوربەسەرە ئەکاتە (حەرامزادەو بیج) جا نەئەمەی شێخ رەزاو نەئەوی ماموستا سجادی •**

**٩ ـ کەباسی جۆری خانوو ئەکات زیاتر خانوی** لادێ ی پیشمان ئەدات لە جۆری خانووی **شارستان نادوێت ، لە خەتی کەرکوك و هەولێرو موسڵ خانوو بەبەردو گەچ و لە**

**ناوەوە لەسەر چەند پارچەیەك ناوئەنرا وەكو (گویز ، یان گوێز ، دوێر ، عەتەبە ، كۆشك، شوقەلەت ) كە هەریەك لەم شوێنانە بۆ شتێك بەكار ئەهێنرێن .**

١٠- سەررای ئەو نەوعە راوانەی مامۆستا فەرموەیەتی رای ژیژكو رێویو ماسیو بزن مژەكیشی هەیە . راوە بەراز تەنها بۆ رابواردن نیە بەلكو بۆ ئەوەیە مەرەزو گەنمە شامی لە چنگ ئەم دورەندەیە رزگاری ببێت . هەندێجار راوە ئاسك لە وەختیكدا ئەكرێت كە ئەو بەسزمانە ئەچێتە سەرئاو بۆ تینوێتی شكاندنەوە یالە كاتی زاوێ ، هەروەها وەك دەربراوە (٩٧) ئاسك كوشتن لە شكاریكدا وەك قەلاچوكردنی گیان لەبەریتر وایە باشە وەك نوسراوە (ئەمە خوا هەلناگرێ) ئەی بۆ فەرمویان ؟

**١١- لەشیوەندا لە شارەكان ژنی تایبەتی هەیە بۆ لاواندنەوە ئەم ئافرەتە بە شیعریكورت باسی ئەو مردوە ئەكات ، هەر ئافرەتیك لە دورەوە كەیەتە كۆری شینەوە بەشیعریكی تایبەتی یادی مردوەكەی ئەكاتەوە ئنجا ئەگەر شەهیدبێ یا لەئاودا خنكاو بێت یابەئاگر سوتاو بێت‌ئەوا گر بەرئەدا تە دلی ئەم‌ئافرەتە بەسزمانەوە ، هەروەها دەهۆلو زورنایەكی تایبەتی لەو مناسبەتە لێ‌ئەدرێت پێی ئەلێن (چەمەرانە) .**

١٢- مامۆستا بەخواهشتو تەخوا هشت توشی هەندێك وشەی هەلەبوە وا لەخوارەوە دروستەكانی ئەنوسمەوە :

| هەلە | دروست |
|---|---|
| قنگیداوەتەسەری : لاپەرە(٦٣) | لەسەری دانیشتوە |
| ئەسكەملی : | كورسی ـ كوردییەكی پەتیە لەو كورسییەوە هاتوە لە كویستانەكان لەدەوری ئاگردان لەسەری دائەنیشن . |

كوشتنەوەی مەڕ : لە بادینان ئەمە بەكار ئەهێنرێ، بەلام لای ئێمە ئەوترێ ( مەڕ سەر برین ) بەلام گورگو رێویو بەراز ئەكوژرێن .

مازوو كردن : مازوو ناكرێت بەلام ئەوتری ( مازوو چنین ) .

سەماورتێئەخرێ : تێ ئەكرێ وەیا پر ئەكرێ‌لەئاو .

گلە : گلەیی .

بەپەتەكە دەرگای كونەكەی بەست } بەپەتەكە دەمی كونەكەی بەست

١٣- لەنووسیندا مامۆستا یەك شیوە ئیملای بەكار ئەهێناوە وەكو :

أ - (رێ)ی قەلەوی بەسێ جۆر نوسیوە : یاحەوتی لەژێر داناوە یا لە هەری وەیا بەدوو رێ نوسیویەتی ، جار بە جار رێیەكی تری تووش هاتوە بوەتە سێ رێ وەك : (ئەبرررێ ـ لەلاپەرە ٤١ دا)

ب - لەهەندێ شوێندا لە جیاتی سەر ـ الفتحە ـ (ە)ی بەكار هێناوەو كەچێ لە هەندێ شوێندا لێی نەپرسیوە لەبەر ئەمە وشەی (یەكیك)بەدوو چەشن‌نوسراوە (یەكێك) (یكێك) .

ج - هەروەها لە جیاتی بۆری قاف لە وشەی (قرآن) واوی بەكار نەهێناوەو وای نوسیوە ( قرئان ) .

**لەكاتێكدا ئەم لێكولینەوە پێشكەش خوێنەری بەرێز ئەكەم دوبارە داوای لێبوردن لە مامۆستا ئەكەمو بە خوێنەرانی ئەگەیەنم كەهیچ وەختێك خۆم لەگەل مامۆستا ناخەمە تای تەرازویەكەوە .**

**پاش ئەم هەلسەنگاندنە بۆمان دەرئەكەوێ كە كتێبی كوردواری زۆر بەنرخو بەكەلكە ، پێویستە سوودی لێوەربگیریت ، ئەگەر خەلقەكە گلەیی لەوە ئەكەن كەپارەكەی زۆرەو بە زروبەی خوێنەران ناسزێت لەكاتێكدا ئەمە ئاراستەی مامۆستا خۆی ئەكەمەوە ئەلێم ئەركو ئەمەكی ئەم كتێبە نارەحەتی چاپو چاپەمەنی كوردیو گرانی كاغەزو نرخی تایبەتی ئەم كتێبە ئەبێ ئەوە داپۆشێت ، ئیتر وەك ئەلێن (دەستم لە هەوێرە هەر ئەوەندەم لەبیرە)...**

**لە گۆڤاری (بەیان)دا ژمارە ١٤ لاپەرە ١٣ سالی١٩٧٤ دکتۆر عبدالرحمن ئەڵێت :**

**ئەگەر دو دەنگی وێکچو ، یاخود لێك نزیك بکەونە پاڵ یەکەوە لە دەربریندا یەکێکیان ون ئەبێ وەك کورتر = کورت + تر ...**

بــۆ بەرژەوەندی زمانەکەمان بە پێویستو هەلم زانی کە ئەم باســە رون بکەمەوە ، بێ‌گومان نمونەی «کورتر» نابێتە بنەیەکی گشتی بۆ رێزمانی‌کوردی چونکە هەر وەك لە نمونەی «کورتر» یــەك پیتی (ت) قوت ئەدرێ بەڵام لە هەندێ نمونەی تردا‌ا ئەبێ هەر دو پیتی (ت) یەکە راوێژ ( تلفظ ) ئەکرێن وەك چوست ـ چووستتر نەك چوستر .

**جا بۆ ئاگاداری وا لە ژێرەوە ئەم دو بنــــە راستەڤینەیە دەر ئەخەم : بنەی یەکــەم : هــەر رەوشتێك (صفة) کە دوایی پیتی (ت) بێ و پێش‌ئەم پیتەش یەك لـــە پیتەکانی بزوێن ـ ناســـاز [ ١ ، و ، ۆ ، ە ، ی ، ێ] بێ کـــە بکرێ بە ( اسم‌التفضیل ) ئامرازی ( تر ، ترین )ی ئەخـــرێتە دوایی‌یەوە لەم دۆخەدا دو پیتی (ت) ئەکەونە تەك‌یەکەوە و هـــەر دوکیشیان دەرئەکەون وە ئـەبێ بنوسرێن وەك :**




● نمونەی ( ا ، ت ) وەك لات
لاتتر نەك لاتر
لاتترین نەك لاترین

● نمونەی (و ، ت) وەك روت
روتتر نەك روتر
روتترین نەك روترین

● نمونەی (ۆ ، ت) وەك پۆت
پۆتتر نەك پۆتر
پۆتترین نەك پۆترین

● نمونەی ( ە ، ت ) وەك کەڵەگەت
کەڵەگەتتر نەك کەڵەگەتر
کەڵەگەتترین نەك کەڵەگەترین

● نمونەی (ی ، ت) وەك قیت
قیتتر نەك قیتر
قیتترین نەك قیتر

● نموونەی (ێ ، ت) وەك شێت
شێتتر نەك شێتر
شێتترین نەك شێترین

**بنەی دووەم : ئەگەر دوایی رەوشت پیتی (ت) بوو پێش ئەم پیتەش یەك لە پیتەکانی ساز (صحیح) بو کە توشی ئامرازی (تر) یان (ترین) هات هەمیسان دو پیتی (ت) ئەگەنەوە یەك بەڵام یــەك پیتی (ت) قوت ئەدرێو ناشنوسرێ وەك :**




× درشت ـ درشتر ( درش ـ تر ) نەك درشتتر
درشترین (درش ـ ترین) نەك درشتترین

× مەست ـ مەستر (مەس ـ تر ) نــەك مەستتر
مەسترین (مەس ـ ترین) نەك مەستترین

× کورت ـ کورتر ( کور ـ تر ) نەك کورتتر
کورترین ( کور ـ ترین ) نەك کورتترین

× سست ـ سستر ( سس ـ تر ) نەك سستتر
سسترین ( سس ـ ترین ) نەك سستترین

**هەر وەهاش لەگەل وشەی سەخت ، پوخت ، پەست ، سفت ، خەست ، چوست ، تفت ، هەست ( بەهەست ) بەخت ( بە بەخت ) ... هتد .**

« پێشکەشە بە هەموو ئەوانەی ئەیانەوێ
بە دووکەڵی داری تەڕ ، بەری دیتنی ئەستێرەی
گەشی تاریکەشەو لە دڵدارە شەونوخنی‌کێشەکان
بگرن ٠٠ »

محمدی مەلا کریم

شیرین ٠٠ کیژی کوردستانە ٠٠
شیرین ٠٠ پەروەردەی شاخانە ٠٠
شیرین ٠٠ مەلاشووی بە بەفراو تەڕ کراوە ٠٠
شیرین ٠٠ بانگی ( لاوك ) یە گوێیا دراوە ٠٠

شیرینی شۆخ ٠٠ لەسای کەلاوەی (دمدم) ا پێی‌گرتووە ٠٠
( مەم و زین ) ڕازی دڵداریی فێر کردووە ٠٠
شیرین ٠٠ چاومڕوانی دەستی تەنها خـــاوەن قولەنگێکە ٠٠
گوێقولاخی زایەڵەی شەوی زەنگێکە ٠٠

شیرین ، بە شاڵو شەپکێ ، (فەرهاد)ی خۆی لێ تێك‌ناچێ ٠٠
بە بیستنی (کەڕەنا)یەك ، هەرگیز سۆزی (شەمشاڵ) لە گوێیا لاناچێ ٠٠
شیرین ٠٠ باش فەرهاد ئەناسێ ٠٠

دانەماوە بۆ هیچ کەسێ ٠٠ بۆ هیـــچ قسەو باس‌و خواسێ ٠٠
شیرین ٠٠ دڵداری فەرهادەو ٠٠ تەنها هەر فەرهادی ئەوێ ٠٠
هەر (خوسرەو) ڕەنجی بەبادەو ٠٠ هــەر پەیوەندی دڵ سەرەنجام سەرئەکەوێ ٠٠

●

فەرهاد ٠٠ فەرهادی ڕەنجبەری بەدناو کراو !٠
فەرهاد ٠٠ عەودالی خۆشەویستی‌و کانیاو !٠
با صەد خوسرەو بیانەوێ شیرینت لە دەس بفڕێنن ٠٠
بیانەوێ بەری ڕەنجی چەندین ساڵت لێ بسێنن ٠٠
با صەد فەرهادکوژت لە دەوروبەر خڕ بێ ٠٠

سەرت باران ٠٠ چوار دەورت با ٠٠ ژێر پێت بەردو دڕكو قوڕ بێ ٠٠
تۆ خەریك بـە ٠٠ هـــەر قولەنگی هونەرمەندیت بوەشێنە ٠٠
بۆ هەزاران وەچـەی دواڕۆژ ڕووی (بێستوون) بنەخشێنە ٠٠
کینەی ناحەز بووروووژێنە ٠٠

دڵی ئەوەی بە ڕەنجەڕۆی ناو ئەبردی ، داخورپێنە ٠٠
تـــۆی سەرچاوەی ئاوەدانی‌و خۆشەویستی‌و نانو ڕۆزی ٠٠
تۆی ـ ئـەمڕۆ بێ ، سبەینێ بێ ـ لـە بەردی ڕەق نان بۆ خەڵکی هەڵئەگۆزی ٠٠
هەرچی ئەکەن ٠٠ هەرچی ئەڵێن ٠٠ با بێو بەلای گوێتا بڕوا ٠٠
تۆ بێو خودا ، هەرگیز مەڕوانە بەرەودوا ٠٠٠
شیرین ، هەر شیرینی تۆیە ٠٠

هەزار خوسرەو ئەمرن ، هەرگیز تامی ناکەن ٠٠
دەستی لە ناودەس قەت ناخەن ٠٠
نازانن شیرین خاوەنی کام ڕەنگە ٠٠ کام تام‌و بۆیە ٠٠
شیرین کام بێچوە پڵنگە ٠٠ خەڵکی کوێیە ٠٠٠

مۆسکۆ
١٩٧٤/٦/٢٠

# سێزان پێشرەوی هونەری هاوچەرخ

گۆڕینی لە ئینگلیزییەوە ئەحمەد فەرهادی

لە کاتێکدا کە کۆچی دوایی کرد نزیکەی حەفتا ساڵ لەمەو بەر ، هەر ئەوەتە دەناسرا • بەڵام ئەمڕۆ بـــە گرنگترین نیگارکێشی ئەم سەدەیە دەدرێتـــە قەڵەم •

**لـــە ڕووی خۆراهێناندا لەگـــەل سروشتو دەست هێنانی نهێنیەکانی ، (پۆل سێزان) نیگار- کێشی بێ هاوتایە • لەوانەیە بەسوودترین نهێنیش لە ناو ئەم نهێنیانەدا ئەمەبێ : کەهەموو ئەو شێوەو فۆرمانەی لە سروشتدا هەنە بەبێ ژمار ، لە تواناداهەیە کەم بکرێنەوەو بکرێن بەچوار فۆرم : تۆپ خشتەن ، قوچەك و لولەن • (١)**

**ئـــەم دۆزینەوەیە لە تابلۆکانیدا بەدی کراو نەوەی داهاتووش زۆر گەشەی پێدا • نیگارکێشانو کۆلینی (تەجریدی) ئەمڕۆمان دەگەڕێتەوە ســـەر هەمان دۆزینەوەی سێزان •**

سێزان پێشرەوانە هەلکەوتووبو : کەلەگەتو چوارشانەو پڕ • درێنیکی چڕو دوو چاوی ئاگرینی هەبوو • هـــەر لـــە دوورەوە جلەکانی سەرنجیان رادەکێشا کلاوێکی کۆنی دڕاو ، چاکەتێکی شینی ئاسمانیو بەروانکەیەکی ( صدرية ) وای لـــەبەر بووکە لەکەی بۆیاخی نیگار دای پۆشیبو •

تیشکی ئاگـــرینی چاوەکانی دەنگ دانەوەی هەستو جۆشە بەتەوژمەکەی ناخی دڵو دەروونی بوو • هەر لەسەرەتاوە کە قوتابیەکی ١٩ نۆزدە ساڵان بوو ، **هێزی کەسیەتی ئەوەندە ئاشکرا بوو کە ( ئێمیل زۆلا ) پێی گوت « تۆ هی ئەم سەدەیە نیت • بێگومان ئەگەر خۆشەویستی شتێکی کۆن نەبوایە ، تـــۆ بەدەستی خـــۆت دەت هێنـــایە کایەوە • »**

دەربارەی سەرهەڵـــدانی بلیمەتی ســـێزانی لێهاتوو ، هیچ شتێکمان بەدەستەوە نیە • لـــە کاتێکی زۆر ئاسایی لە مێژوودا هاتۆتە سەر رووی زەمین ، زۆر بـــە ئاساییش پەروەردە کراوە لـــە ( ئێکس )دا کە شارێکی بچووکـــە لەســـەرووی فرەنساوە نزیکەی ٢٠ بیست میل لە ( مارسیلیا ) بەو لاوە •

**هەر چۆنێك بێت ، ووتەکەی ( زۆلا ) زۆر راستە • سێزان هی سەدەی نـــۆزدەم نـــەبوو ، بەلکوپێشەوای هونەری سەدەی بیستەمە ، ئەگەر ئێستا هـــەر کەسێك مافی ئەوەی هەبێ کـــەپێی بووترێ « باوکی نیـــگار کێشانی نوێ » سێزان تەنهاکەسە • ئەو کار تێکرد نە گەورەیەی کە کردو بەتیـــە سەر مامۆستاکانی هۆنەری تـــازە وەك : پیکاسۆ ، ماتیس ، دیرەینو براك باشترین بەلگەیە بۆ راستی ئەم ناوبانگە •**

هونـــەر بەسووكو سانایی رووی نەکـــردە سێزان • جارێ هەر لەهەوەڵەوە پێویست بـــوو بێئارامیو توند وتیژیو خێرا هەڵچوونی خـــۆی سندم بکات ، چونکە نیگارکێشان مێشکێکی هێمنو سافو دلێکی گەرمو پڕ ئیلهامی دەوێ • سێزان زۆر خێرا تووڕە دەبوو وەك بۆمباش دەتەقیەوەو لە هێستریکیش چەمووشترو لاسار تر بوو • بۆیـــە پێویستی بەجلەو کردنی سۆزو جۆشی خۆی هەبوو لەپێناوی وەدەست خستنی زانیارییەکانی پێویست بۆ نیگار کردن •

**لەهەرەتی لاویدا ، زۆر جـــار کەهەلەیێکی دەکرد ، ئەو جانگەی (جنفاص) کە نیگاری لەسەر دەکرد ، هەلی دەزڕاندو پارچە پارچەی دەکرد ، یا بەهەموو هێزیەوە تێی هەڵدەدا دەرەوە •**

لەدوا بەدوایی ژیانیدا کەتابلۆیەکانی بەپارەی چـــاك دەفرۆشانو خـــۆشی هێمنتر ببوو ••• رۆژێکیـــان ئەو کابرایەی تابلۆیەکانی بۆ ســـاخ دەکردەوە ، چوو بۆلای • لەنزیك ستۆدیوی سێزان شتێکی بینی بەدارێکەوە شۆڕببۆوە ، کـــە لێیو وردبۆوە بۆی دەرکەوت کە ئەو شتە یەك لەتابلۆیە

تەواو نەکراوەکانی بوو کەوا لەسەردەمێکی توورەو تیژیدا فرەی دابوە دەرەوە ·

لەهەموو لایێکەوە تـــەنگەو چــەڵەمە رووی تێ‌کرد · باوکی بەڕیوەبەری بانکی (ئێکس) بوو دەرگای هونەری لێ‌داخست کە ئەوپەڕی ئاواتی‌بوو· بەزۆرە مـــلی تووشی یاسا خوێندنی کرد ، بـــەڵام کەئەمەش سەری نەگرت ، سێزان بەناچاری رووی کردە کار کردن لە بانك · باوکی دەرفەتی نەدایێ بچێ بۆ (پاریس) بۆ خوێندنی هونەر تاوەکو تەمەنی نەگەیشتە ٢٤ بیستو چوار ساڵی ·

لـــەم قوناخەدا گیروگرفتێکی سەخت هاتـــە کایەوە : بۆ سێزان دەرکەوت کە لەتوانای دا نیـــە خۆی بگونجێنێ لەگەڵ رێبـــازە لاسای‌یە هونەریە باوەکانی ئەو کاتە · زۆر خۆی ماندوو کرد بەڵام رەسەنی (ئەساڵەت) لەوناو (کیانی)دا رسکابوو ·· هـــەر بۆیەش ئەنجامی کۆششو تەقەلای ســاڵو نیوێکی ســەر نەکەوتن بوو لـــە تاقی کردنەوەی وەرگیران لەکۆلێجی هونەرە جوانەکان ( ئیکۆل دی بۆ ئارت ) · ئەم تاقی کردنەوەیەش بریتی بوو لە چەنگێك نەریتو بەهای کۆنو رزیو ، کە چـــارە نووسی تێ‌هەڵدان بوو لەدوا رۆژا لەسەر دەستی سێزان ·

**تابلۆو نیگارەکانی سێزان لـــە پێشـــانگای ساڵانەی نیشتمانی (ساڵۆن پاریس) وەر نەدەگیران بەلای کەمی بۆ ماوەی (٣٠سی) ساڵ · ئەم پێشا ـ نگایەش ـ لەو کاتەدا ـ تەنها ئامراز بوو بەدەست هونەر مەندەوە بۆ پەیدا کردنی لایەنگیران بۆخۆی ·· بەڵام سێزان هەر بەتەنها رێگەی لێ نەگیرابوو ، بەلکو هەر لە یادیش نەمابوو ·**

کاتێ کە یەکــەم پێشانگای بۆ بەرهەمەکانی خۆی کردەوە لەســاڵی ١٨٩٥دا تەمەنی گەیشتبوە ٦٠ ساڵ · بەکرێی لەماڵی خۆیدا دەژیا بێ ئەوەی تێکەڵی کەس ببێو کەسیش بیناسێ · ئـــەوانەی دەشیان ناسی چـــەند دانە نیگارکێشێکی وەك خۆی بوون ، کەئێستا ناوبانگیان ئاسۆی داگرتوە وەك : رێنوا ، مۆنێت ، دێگا ، پیسارۆ ، گۆگوین · بەڵام ناسینی ئەمانە هیچ جـــۆرە سوودێکی بۆ سێزان نەبوو ، چونکە ئەمان لەو نەفرەت لێ‌کراوتر بوون· بەکورتی کەسیان توانای سەرنج راکێشانیان نەبوو بۆ بەهرەی سێزان ····

**برادەرو دراوسێ‌یەکانی ـهەروەها باوکیشی ـ سێزانیان بەهونەرمەندێکی سەرنەکەوتوو دەژمارد· باوکی بـــە منداڵێکی زل خـــەیاڵ خاوی دادەنا ، دانیشتوەکانی شاری (ئێکس) بەلاوەکی‌یان دەدایە قەڵــــەم · زۆربەی هونەرمەنـــدان پێ‌یان دەووت « سەر لێ شێواو » · زۆڵای هاوڕێشی پاش ٣٠ساڵ هەڵسو کەوت کردن لەگـــەڵیا ناوی‌نا « بلیمەتی ناوەخت »ی بەزەیی پێ‌هاتوو ·**

گۆشەگیری سێزان کاری کردەسەر ژیـــانی دڵداریشی · لەتەمەنی ٣٠ ساڵیدا کـــەوتە داوی « هورتێنس » کەیەکێك بوو لـــەم کچە مۆدیلانەی نیگاری دەکردن · لەئەنجامی سێ ساڵ پەیوەندی بەستنی نارەوا ، کورێکیان بوو · سێزان خۆی‌کردە خاوەنی‌و خستیە سەرناوی خۆی ، تارادەی پەرستن خۆشی دەویست بەڵام لەبەر چـــەند هۆیەکی ئاڵۆز نەیتوانی « هورتێنس » مارە بکات · ناوە ناوەش چەند مانگ لەیەکتر جیا دەبوونەوە ·

**بروای سێزان بەخۆی کز نەبۆوە لەگـــەڵ ئەوەشا کە ژیانی پڕ تاسەو نائومێدی‌و گۆشە گیری بوو · هەمیشە نیگاری خـــۆی زۆر بە ئەسپایی‌و وورایی دەکێشا ·**

بازاڕی فرۆشتنی تابلۆیـــەکانی زۆر سست بوو ، بەڵکو هەر نـــــەدە فرۆشان تاوەکو تەمەنی گەیشتە ٥٠ پەنجا ساڵیش ! یـــەك لە تابلۆیەکانی گۆڕیەوە لەگـــەڵ دوکاندارێك بە هیندەك شەکرو چا · فرۆشیاری بۆیاخی نیگاری ناسیاریشی چەند تابلۆیەکی لێ وەرگرت بەرامبەر بە بۆیاخ ! لـــەدوا رۆژا بێوەژنی ئـــەم فرۆشیارە توانی تابلۆیەکان بفرۆشێتە وە بەنرخی ٣ هەناوەکو ١٥ پاوەن ·

**لەپاشدان بازرگانـــە هونەریەکان بایەخیـــان بەسێزان دا ، هـــەر بۆیەش نرخەکان تەرەقەیان کـــرد · لەتەمەنی ٦٠ شەست ساڵیدا ٣٦ تابلۆی جانگی بەنرخی ٣ر٦٤٠ دینار فرۆشت ، وانە هەر- یەکەیان بە ١١٤ دینار · نرخەکانیان زۆر زیاتریش بوون بەڵام بەداخەوە خۆی نەژیا بۆ وەی ئەم رۆژە ببینی ·· لـــە ئوکتۆبەری ١٩٠٦دا لەتەمەنی ٦٧ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد · سەرکەوتنەکەی سێزان ئەمرۆ تەواو بوو ، هیچ گالێریەك شوێنی پاراستن وکۆکردنەوەی کەلەپووری هونەری ) خۆی لەچینی یەکەم لەجیهاندا دانانێ ئەگەر بەلای کەمی یـــەك لەبەر هەمە نازدارەکانی سێزانی لێ نەبێ ·**

**زۆربەی نیگارکێشە ناودارەکانی ئەم سەدەیە دان بەسێزان دەنێن کە پێشەواو مامۆستای گەورەی هونەری تازەیە ·**

---

(١) واته : الكرة ، المكعب ، المخروط والاسطوانة·

(*) ئەم ووتارە لەنووسینی « مالکۆلم ڤۆگان »ە ، لەگۆڤاری «ریدەرز دایجێست»دا بلاوکرایەوە ـ دانەی ئینگلیزی ، ژمارە ٥٣٤ ، لاپـــەرە ٤٥ ـ ٤٩ ·

Reader's Digest, Vol. 89 No. 534 pp. 45-49.

# گۆشەی منالان

# ژینی تایبەتی

• نووسینی •
شاکر فتاح •

## ١ ـ خانوو :

(١) هــەر خانوویەك ، پشتی لەڕەشەبابێ‌و ڕووی لەڕۆژ بێ ولەپەنجەرەو دەرگاکانیەوە تێرو پڕ بای‌پاك‌و تیشکی ڕۆژ بێتە ژوورەوەو ، دووربێ لە جروجانەوەرو قاوو قیــژ وتەپ وتۆز ومێش‌و مەکــەزو شێی تــری ، ئەوخانووە بــۆ ژیان و گوزەرانی مرۆڤ بەکەڵکە .

(٢) خانوو چەند باش دوروست کــرابێ و چەند باش ڕێك خرابێ و چەند باش ڕازێنرابێتەوە ئەوەندە ژیان‌و گوزەرانی تیا خۆش دەبێ .

(٣) بۆ ڕۆژی ئیمرۆ خــانوو چەند ساکارو چەند خنجیلانەو جوانکیلانە و کەم ئەرك بێ ، بۆ کەبیانوو ئەمەندە پەسەندە .

(٤) بەکورتی ئــەبێ خانووەکە وابێ کەئەو خێزانەی تیا دەژی بەتەواوەتی ســەرەوت‌و ئارام‌و دڵخۆشی‌ی خۆی تیا دەست بکەوێ .

**(٥) جامنالی پەسەند ئەو منالەیە کەلە ئەرکی ڕاگرتنی خانووەکەی مالی باوکیــا بەپاکی وڕێك‌و پێکی‌و جــوانی‌و ڕازاوەیی‌یەوە ، یارمەتی‌ی دایك‌و باوکی خۆی بدات . تادلی دایك‌و باوکی خۆی شاد بکات‌و فرمانی سەرشانی خــۆیشی وەك ئەندامێکی خێزانەکەی خۆی بەجێ بهێنێ .**

## ٢ ـ باخچەی ماڵ :

خێزان تاپێ ئەکــرێ ، باخچەکەی هــەر چوارلای خانووەکەی بگرێتەوە باشترە . هــەر هیــچ نەبێ لای بەردەمی بەتەواوەتی بگرێتەوە . ئەگــەر ئەوەیش ســەری نەگــرت ، بام تیلماسکە زەوی‌یەك لەبەردەمی ژووری دانیشتنەکەی‌دا بکات بەباخچە . یاخود چەند ئینجا نەیەك گوڵ لەبەردەمی ژوورەکەیدا دابنێ . باخچە بۆ مال زۆر پێویستە . دەی ڕازێنێتەوە ، جوانی دەکات . بۆن خۆشــــی دەکات . نەپو تــۆزی لێ دەگێرێتەوە . فێنکی دەکاتەوە . دڵی ئەنــدامانی خێــزان‌و میوانانی خێزانیش خۆش دەکات .

**جا منالی ووت‌و ووریا و شیرین کردار دەتوانێ لەئامادە کردنی باخچەکەی مالی باوکیاو پاراستنیاو گەشە پێکردنی‌دا یارمەتی‌یەکی زۆری دایك‌و باوکی خــۆی بــدات . تاخۆیشی‌و ئەوانی تریش کەڵــکی لێ‌ببینن .**

## ٣ ـ ماڵ ڕازاندنەوە :

(١) منالێ پێشکەوتوو لەسەر عەرد دانانیشێ‌و نانوێ . چونکە بەوە پشت ئەکۆمێتەوە و ، لەش ماندوو ئەبێ‌و ، چاوکز ئەبێ و نەخۆشی ئەگات بە پیاو . لەبەر ئەوە لەسەرکورسی دائەنیشێ ، لەسەر تەخت نــەنوێ . ژووری خــواردن‌و دانیشتن‌و نوستنەکەی بــە کورسی‌و مێزو تەبلەك‌و تەخت دەڕازێنێتەوە .

(٢) بۆیەکا تەخت‌و کورسی‌و مێزو تەپلەکیش بەکار دەهێنێت ، تازۆرتر بحەسێتەوە .

(٣) کەلوپەل‌و مسینەو چێوینــە ونووسراوو بابەتانی شووشەو بلوور لەناو سنووق‌و دۆلابــدا دادەنێ . تا جروجانەوەریان پیــا هەڵنەگەڕێت و تۆزیان لێ‌نەنیشێت .

٤ ژووری دانیشتن‌و میوان بەگوڵ‌و پەیکەرو وێنەی جوانی ڕەنگاو ڕەنگ دەڕازێنێتەوە . هەروەها ووریای ئەوەیش دەبێت کــە پەیکەرو وێنەکان هی نیشتمانەکەی و نەتەوەکەی خۆی بن ، یاخود هی ئەو کەسانەبن کەبەکەڵکی هەموو جیهان هاتبن .

## ٤ ـ نووسراوخانه :

نووسراو ( كتێب ) ، دۆستێكی دلسـوزو هاودەمێكی رووخـۆشو یارێكی بەجۆشو خرۆشو مامۆستایەكی زرنگو بەهۆشـه • لەبـەر ئـەوه خێزانی پێشكەوتوو ،نووسراوخانه یەكی خنجیلانەو جوانكیلانه لـه ژووری دانیشتنه كـەی خۆیدا دادەنێتو پڕیشی دەكات له نەخشەو وێنەو گوڤارو نووسراوانی خۆشی خۆشیو بەكەڵك و نایاب ، تا لەشەوانی پاییزو زسـتاندا ببنه گـوڵی كۆڕی خێزانو میوان ، كه منالیش ئەندامێكن لەوان •

## ٥ ـ سازو ئاوازو گۆرانی :

لەهـەموو مالێكی پێشـكەوتوودا پێویسته شمشالێك ، یاخود تارێك ، یان عودو كەمانێك ، یان گرامەفۆن رادیۆ وتەلەفیزیونێك هەبێ لەگـەل چەند دەنگ خۆشێكدا • چونكه گۆرانیو سـازو ئاوازی خۆش ، سـەر سووك ئەكەن ، دل خـۆش ئەكەن ، لەش ئەبووژێنەوه ، بۆهەموو خاوو خێزانو میوانانیش دەبنه گۆلی كورو پەزیشكی دلسۆز •

## ٦ ـ گاڵتەو گەپو قسەی خۆش :

هەروەها خێـزانی پێشكەوتوو ، ئەندامەكانی بایەخ ئەدەن به لەبەركردن و گێرانەوەی گاڵتـەو گـەپی خۆشو قسەی شیرینو چـیرۆكو پـەند و ئامۆژگاری و هۆنراوەی ناوازەو نایاب ، تا لـه كاتی كۆبوونەوه كانیاندا به هـۆی ئەوانەوه دلی یەكتری خۆش بكەنو مێشكی یەكتری زاخاو بدەنو سرەوتی گیانی یشی بەیەكتری ببەخشن و بەوانه خۆیان بحەسێننەوه •

★

ژیانی رۆژانەی هەموو خێزانێـك ، جاروبار دەەئالۆزیو ناخۆش دەبێو پـری دەبێ له ئەركو ئازار • بـەلام كـه خێزان وەك لـه سەرەوه پیشانماندا ، خۆی خەریك كرد بەو شته ناوازه و نایاب و خۆشی و بەكەلكانەوه ، باری گرانی سووك ئەبێ وئەو ئەركو ئازارانەی زوو له بیر ئەچێتەوەو روو ئەكاتەوه كامەرانی •

**جا منالی بەهۆش ، دەتوانێت ، لەم رووانەوه ، زۆر بەكەلكی خێزانەكەی خۆی بێتو ، تائەندازه ـ یەكی گەورەیش ببێتەشەو چـرای دایكو باوكیو براو خوشكەكانی • كەبەوه خۆیشی زۆر خۆشی و شادمانیی پێ دەگات •**

* * *

**پاشماوەی لاپەرە (٩)**

**پەراوێزەكان :**

(١) لێرەدا ، وەك رێمان نەبێ بەدرێژی باسی بكەین وایە ، چونكه ئەگـەر پاشماوەی زنجیرەی پێشوو نەبوابه ، ئـەمجـۆره نووسینه زانستیانه نەئەخرانه گۆڤاری وەك (بەیان)ەوه ، هـەر وەك بلاوی كردەوه ، چونكه بوه به گۆڤارێكی تایبەتی بۆ ئەدەبو هونەر •

(٢) لەم بەشەدا ، وەلـه زنجیرەی پێشوودا باسی بەند ( فقره) ( أ )ی كرا ، كەبریتی بوو لـه ژماردن ، له (یەكەوه) هەتا وەكو (دە) •

(٣) لەوەو پێش گۆڤاری (زانیاری) تایبەتی بوو بەبلاو كـردنەوەی شتی زانستییەوه ، وەك زماننانسی (زمانەوانی)و غەیری زماننانسی له هەموو جۆره زانستێك ، بەلام ناشكری نەبێ ئەمه ماوەیەكه دەرناكەوێ ، هیوا دارین كه سەر لەنوێ خـۆی گورجو گـۆل بكاتەوەو زۆر به رازاوەیی خـۆی دەرخاتەوه •

هەروها هیوادارین كه گۆڤاری (بەیان) سەر لەنوێ چاوێ بخشینێتەوه به بریارەكەیدا چونكه گۆڤارەكه ، هەروەك ئەدەبیو هونەرییه بەرای من، وه بۆ تامەزرۆ ، زانستیشی تێدا بێ باشتره ، جگه لەوەی كه ئەم جۆره رایانه دەر بارەی بلاو نەكردنەـ وەی جۆره نووسینی زمانەوانیو ، ساردكردنەوه و كەمتەر خەمی ئەروێنێ •

(٤) (نێـر) و (مێ) ، لـەزاری هەورامیدا باسێكی دوورو درێژه ، وەبەم بۆنەشەوه باسێكی تایبەتیم هەیه ئەگـە رماوەمان هەبوو بـلاوی دەكەینەوه •

(٥) وشەو موفرەداتی لـەم دەنگەو جـۆره ئێجگار زۆرن بێگومان باسێكی تایبەتیان ئەوێت •

(٦) هەتا بلێیت ، لـەم رووەوه نموونەمان زۆره ، بۆ ئەمەش باسێكی تایبەتیمان هەیه •

(٧) كورتەیەكی ئەم بەندانه م ( واتـا لەمـەی ئێره درێژتره ) له ( سەرتایێكی فیلۆلۆژیی‌زمانی كوردی)دا بلاو كردوەتەوه •

(٨) ئومێدەوارم كه سەرچاوەی ترم دەس ـ كەوێ بۆ ئەوەی زیاترو قوولتر لەم باسه بدوێمو باشتر رۆشنی كەمەوه •

(٩) بێگومان تەنها ئەم چوار رسته نییەو بەس ، بەلكو ، هەروەك من بیـزانم ، نزیكەی دە رستەی سەره هـەن ، وەلەم رووەشەوه باسێكی نەختێ دوورمان هەیه (رستەو جۆری رستەو ئەركو واتای وشه له ناو قەوارەی رستەدا ) •

# ئەو چیرۆکەی ئاشنا دوایی نەهاتووە

شەهیب قەرەداغی

له مێژەوه ٠٠٠٠
شوێنی هەلگرتووم وەرام
کەوتۆته دوام ٠٠٠
لەکتێبی زەرد و زلا
له کاوێژی دەم و پلا
وەکو داخێك ٠٠٠
چزا به لێوی ژانما
بۆیه منیش ، حەرفەکانم
کرد به دەفێك له شانما
حەی ٠٠٠ هوو ٠٠٠ ڕووم کرده ئاوایی
لەسەر سەکۆی بەر مزگەوتا
پەنجەم دا بەکەلەی دەفا
پەند ، دەرپەڕی لەپێخەفا
قریشکانی ٠٠٠
جەجال ٠٠٠ جەجال
تۆپەلەیەك جوێنی هێنا
ئاخنیـیه دەمی شەمال
دەنگم نەبا
گوڕی لێم بەست وەك رەشەبا
له ئاگری « نەمروودە »ەوە
هەتا عەسای دەستی مووسای
به تاو هێنام
وەك سێداره
له « گۆلگۆسا »ی توند هەلپێچام
له « کەعبە »دا کردمی به بت
تا له شیوی « یەهیمون » دا
بم تەزێنێ
لەپاشخوانی خەلیفەدا
بم ڕزێنێ
به سەر سینەی کەنیزەکی دەساو دەسا
بم ڕژێنێ
له پاشماوەی مووچڕکێکا

به سەر خۆشی بم زڕێنێ
هەزار مەعقول و مەنقولی دا به ڕووما
هەزار ناتۆرەی گرتەوەو
دای بەشوێن پێی ئیستەو زووما
ئاوایی لێ ورووژانم
دەفەکەم کردەوه شانم
ووتم ئێستە ، من ئاوارەم
سەلایەکی بێ منارەم ٠٠٠
خۆم له خۆما ، گێژاوێکم
دوو سەرو تاقه چاوێکم
دوو سەری تاقه داوێکم
کام سەر نجەمه بەرچاوم ؟!٠٠
کام سەر هەلکەمه سەرناوم ؟!٠٠
وەرام وەك گل هاته چاوم
شۆڕ بووه وه بۆ هەناوم
تۆ پەروەردەی گۆشتی خاوی
مێشی دەوری ڕێی دۆشاوی
لەعنەت له پیاوی درۆزن ٠٠٠،
سەرم کز کرد ٠
پڕ گیرفانم کرد له ڕۆژگار
ڕێگەم گرتو ڕووم کرده شار
بۆ پێشەوه خۆم هەل ئەدا
چاوم ، لێ بوو ، له کاروانا
نەوسیان له « شەیتان » کەل ئەدا
هاتنه وێزەم ٠٠٠
وا پووره یان له چاوم دا
هەزار ڕەنگیان له ناومدا
له ناو توێشووی پێچراوەما
حەرفەکانمیان ئەخواردەوه
فرمێسکی هەلهاتوومیان
له پاروودا ئه شاردەوه
چەرمه چۆلەکەی دنیایان تێ هەل کێشام
بریق و باقی بەردەرگا ، وای وڕ کردم

ئەم ئەزانی وا لە ئێشام
بیرێکم دی لە سەر سەرم
ویستم پرسیاری بۆ بەرم
کە چاوێکم پیا هەڵگێڕا
بینیم نوقمە ٠
قەڵەم ، کاغەز مەزات ئەکا
لە ئازاری دەم و دانی
وەك شمشاڵێ قامیشانی ڕێی (مەسنەوی)
شکات ئەکا
لە برسانا خۆی با ئەدا
لە برسانا خۆی دائەدا
تومەز ، بە دەنگی زەنگەوە
خاڵۆ ، لەشار دەرکرابوو
ووتە نەختینەکانیشی وەك میزەڵدان فوو درابوو ٠
هەر کە نیازم دای لە دەرگا
باوێشکێکی هەڵێ لووشیم بۆ ناخی شار
لە گوێ شەڕستەی گۆڕەپانێك
ڕواندمی وەك چڵێ دار ٠
بە سەر شەقامی ڕژاوا
پەندەکانی جارانی زوو
لەناو دەمی بێ سمێڵا ئەڕشانەوە
هەتاو لە گۆمی سێبەرا
بە سەر یەکا ئەتلانەوە
هەموو شتێك سەرەو ژێر بوو
لەو وێنەدا ، ئەشکانەوە
لووتی شەقامی هەڵکراو
لە بەردەمی پەیکەرێکا ئەبوو بە قۆڵ
شانی وەها بۆ دا ئەدا
سەد کۆڵانی ئەگرتە خۆڵ

چاو دێری ڕێی هەراج خانە
بە دۆژەنکی پشی پشی
خەرمانی خۆی ئەکوتایەوە
ئەوەی ئەی ووت ، ئەی وتەوەو سڵاوی بۆ ئەدایەوە
دروشمەکانی بەردەمی
لە شەرمانا ئەتوانەوە
حەرف لە حەرفەکەی تری
پێزو واتەی ئەکوژانەوە
هەموو شتی بۆ بازاڕ بوو
بە پارە بوو
هەموو کەسێ بە دوای شتا ئاوارە بوو
لە قولایی تاریکی دا
جار جار لە ئەستێ یان ئەدا ٠٠٠
مەستێ ، تۆراوێ ، عەودالێ
کۆڵانەکان ، لەژانا بوون بۆ منالێ ٠
ئا لەو جێگەی تیا ڕووا بووم ،
لە بەر چاوی حۆڵەکانا
چمکێ لە سێبەری خوا بووم
بای داراوس ڕێگەی نی یە رام تەکێنێ !٠٠
چرۆی نازم لە سەر بدا
لە ناخەوە بم شەکێنێ !٠
لە سەر هەرزاڵەی دوکانێك لەوبەرمەوە
چەند مەلحەمەی وەك « ئۆدیسا »
ئینجیلێك بوون بەبێ « عیسا »
وردە « قەشە » هاتو چۆیان تێدا ئەکرد ٠٠٠
بۆ کەرەسەی پەندی تازە
هەر تاڵێکی پچڕاوەیان ئەدی یەوە
ئەیان فیژان ، سەری ڕازە ٠!
بەکالیسکەی چەپڵە لێدان
سێبەری « میر » گەیشتەلام
هەردوو گوێی پڕ کرد بوو
لە وەرامی درۆی سەلام
سەرێکی بۆ منیش لەقان
یەك دوو حەرفی خۆش کراوی بەفیزەوە بەلێو تەقان٠
بەناو شەپۆلی چەپڵەدا ، لە تاوێکا
هەرچی دەفتەری مێژووە هاتوو ڕژایە ناو دەمم
تێکەڵ بوو بەژان وخەمم
تفێك بوو دام بە ڕووی ئەوا
لە پێش بەیانی دوا شەوا ٠
ووتم ٠٠٠ ئەڕۆم
زێ یەوان نیم ، بۆ ئەم شارە
یا ساوڵ نیم ، بۆ ئەم شەقامە سەرخوارە
من ؟!٠٠٠
من ، چۆن بڕۆم ؟!٠٠٠
چۆن لەبەری حەرفەکانم نابێ بخۆم ؟!٠٠٠
گوێ گرەکان
ئالێرەدا وا دێمەوە بۆلای ئێوە
پاڵەوانی چیرۆکەکەم هەر وا لەشار
دەفتەرێکی دایە دەستم
وەڵامی نوێی پرسیارەکان
نەخرا بووە بەرهەوێڵی کڕیارەکان
نەدرابووە بەرساتۆری بڕیارەکان
پێشەکی یەکەی نەنووسراوە ٠٠٠
بەقەڵەمی بەڕێزەکان
دەستو پەلی نەبەسراوە ٠٠٠
بەڕێی پەندە بێ پێزەکان ٠
حەرفەکانی لە نەورۆزا
گوڵی مژدەی تۆو بەرە
لە هەورازی ڕێی کاروانا
داری سەهەن و سێبەرە

**پاشماوەی لە لاپەرە ٣٠**

# مامەند کەرکووکی کێیە؟

نووسینی : کەریم شارەزا .

لە سەرەتای سالّی ١٩٥١دا هەندێ لەژمارەکانی گۆڤاری [زاری کرمانجی][1]م چنک کەوتو دەستم کرد بە هەلّدانەوەی پەڕکانو خوێندنەوەی بابەتەکانیانو بەزۆریش هەر لەشیعرە نیشتمانیو نەتەوەییەکانیەوە وورد دەبوومەوە ، تاکوو کەیشتمە لاپەڕە (١٢)ی ژمارە (٨)ی سالّی یەکەمی گۆڤارەکە ، کە لە بەرواری ٢٠ی شوباتی ١٩٢٧دا پەخش کراوە ، چاوم بە هۆنراوەیەکی نەتەوەیی لە قالّب و روخسارێکی جیاواز لە قالّبو روخساری شیعری کلاسیکی ئەو سەردەمە کەوت کەپێك هاتووە لە چوار [ حەوت خشتەکی] ، دێڕی یەکەمو سێ یەمی هەر کۆپلەیەکی سەروایەکو دێڕی دووەم و چوارەم و پێنجەمی جۆرە سەروایەکی ترو دێڕی شەشەمو حەوتەمیشی جۆرە سەروایەکی تریان هەیە ، لە ماناشدا هۆنراوەکە بە تێکرایی ناوەڕۆکێکی سیاسی پێشکەوتووانە دەدا بە دەستەوە بە دەربڕینی خۆشیو ناخۆشیو هیواو ویستە و ئاواتەکانی میللەتی کورد ، لە کۆتایی هۆنراوەکەشدا ناوی[ مامەند کەرکووکی ] خاوەنی نووسراوە !

**هەر لەو کاتەوە هەستم بەوە دەکرد کەئەم هۆنراوە یە لەداڕشتن وروخسارو ناوەڕۆکدا جیاوازە لە گەلّ هۆنراوەی شاعیرانی ئەو سەردەمە ، تەنانەت لە گەلّ شیعری شاعیرە هاوچەرخەکانیشیدا جیاوازیەکی دیاری هەبوو • هەر چەندە لەو کاتەدا توانایەکی ئەدەبی وام نەبوو تا بەکامی دلّ بەئامانجو • مەبەست بگەمو بۆم ساغ بێتەوە ئەو [مامەند کەرکووکی]یە کێیە ؟!**

بەلاّم ئەوەندەم هەست دەکرد کەئەم هەلّبەستە جۆرەشیعرێکی نوێ بابەتو سەرەتایەکە بۆ چوونە ناو قۆناغێکی نوێی ئەدەبی کوردی • هەر کۆپلەیەکی هەلّبەستەکە بەم دوو دێڕە کۆتایی دێ :ـ

**ئەم سالّەیە ، سالّی فەرەحو شادیو خەندان ،**
**ئەم سالّەیە ، دەشکێنێ هەموو بەندو کەلەپچان !!**

ئەم دوو دێڕە شیعرە لەو ساوە ببوون بە ویردی سەرزارمو کە هەر راپەڕینو جوولاّنەوەیەکی نیشتمانی لە عێراقدا بەگشتیو لە کوردستاندا بەتایبەتی بەرپا بووبایە ، من یەکسەر [مامەند کەرکووکی]و ئەو دێڕە شیعرانەیم دەهاتەوە یاد و دەبوونە سروودی خۆش ئاوازی سەرزارمو وام دەزانی کە بەبۆنەی ئەو راپەڕینو جوولاّنەوەیە دانراون •

هۆنراوەکە بەناو نیشانی [ بۆ م• نووری][2] یەو بەرواری ١٩٢٦ی بەسەرەوەیەو وەك بۆی چووبم ئەم هۆنراوەیە لە وەلاّمی هۆنراوێکی [شێخ نووری شێخ سالح ١٨٩٦ ـ ١٩٥٨]ی (شاعیری نوێ خوازی لە ئەدەبی کوردیدا ) کە بەبۆنەی شۆڕشەکەی کوردستانی تورکیاوە لە سالّی ١٩٢٥دا دای نابێو گلەیی لەو سالّە شوومە کردبێ کە بەسەر گەلی کوردی جگەر ـ سووتاو داهاتوە • کەچی [ مامەند کەرکووکی ]ی شاعیری نە ناسراوی بەرچاو روون بەپێچەوانەی [ شێخ نووری ]ی هاو ڕێی ، ئەو سالّە بە سالّێکی گەلێ پیرۆزو پڕشادیو بەسالّی شکاندنی بەندو کەلەپچەی دیلیەتی دەداتە قەلّەمو ، ئەو کەللە سەرو خوێنی شەهیدانی گەلی کوردەش بە تۆوی ژینو ئازادی میللەت دا دەنێو خوێنی رژاو و فرمێسکی هەتیوانیش بە ئاوی ژیان و رووانو شین بوونیو دەلّێ :ـ

**سالّی ١٩٢٦ بۆ کاك ـ م• نووری[3]**

**ئەم سالّە کەتۆ لێی ئەدوێی پڕگلەیی لێی**
**سالّێکی گەلێ خۆشو گەلێ روونو عەزیزە**
**سالّێکی بە مزگێنیو پڕ فەخرە ئەگەر بێی**
**راوەستی لە پاشان تێ دەگەی چەندە لە زیزە**
**ئەم سالّە گەلێ قودسیو پیرۆزو تەمیزە**
**ئەم سالّەیە : سالّی فەرەحو شادیو خەندان ،**
**ئەم سالّەیە : دەشکێنێ هەموو بەندو کەلەپچان !!**

★

**ئەو کەللە بە نرخۆ بەدلّەی لاوو شەهیدان**
**تۆوێکە کەچێندراوە لەبۆ ژینو نەجاتە**
**ئەو خوێنە رژاوانەو فرمێسکی هەتیوان**
**یارا لەبۆشین بوونی وەکوو ئاوی حەیاتە**
**ئەم سالّە وەکوو رۆژە بەلاّم رۆژ ••• هەلاّتە؛**
**ئەم سالّەیە : سالّی فەرەحو شادیو خەندان !**
**ئەم سالّەیە : دەشکێنی هەموو بەندو کەلەپچان !!**

وەلە کۆپلەی چوارەمی دا دەڵێ :ـ

**ئالایـــەکی میللی کـــە نەرازێتەوە بەخـــوێن ،**
**کەم حورمەت ئەبێ ئـەو دەکەوێ زۆر زوو لەقیمەت !**
**شانو شەرەفی قەومێ بە خوێناوی ببێ شین[6] !**
**زی حیشمەتە بۆ سەتوەتە ئـەو تا بەقیامەت**
**مردن شەرەفە بۆ ڕەهی رزگاریی میللەت**
**ئەم ساڵەیە : ساڵی فەرەح‌و شادی‌و خەندان ،**
**ئەم ساڵەیە : دەشکێنێ هەموو بەندو کەلەپچان !**

« کەرکووکی : مامەند »

هەر خوێنەرێکی ئەدەب پەروەر ئەم هۆنراوەیە بخوێنێتەوە چاوی بەگـــەلێ دەربڕینی ئەدەبی نوێ دەکەوێ‌و هەست بە تازە کردنەوەو شکاندنی کۆتی قاڵبی کـــۆنی شیعری کلاسیکی‌و قوتابخانەی غەزەل دەکات‌و جۆرە ناوەڕۆکێکی‌سیاسی بەستراو بە بەرژەوندی میسەتی کوردو نیشتمانەکەی بەدی دەکات ٠

من زۆر جار دەهاتمە سەر ئـــەو ڕایەی کەبڵێم ئەم شاعیرە نەناسراوە هەر عبدالخالق ئەسیری[7] [١٨٩٠ ـ ١٩٦٢] بوو بێ و جاروبار بە ناوێکی خوازراوەی وەك [مامەند کەرکووکی] شیعری لـــە ( گۆڤاری زاری کرمانجی )دا بـــــلاو کردبێتەوە ٠

بەڵام لە دواییدا کەلە شیعرەکان وورددەبوومەوە دەم دی لەشـــــێوەو روخساری هۆنراوەکانی ( ئەســـیری ) ناچن‌و لێك دوورن‌و کەم وایە (ئەسیری) لەشیعر دانانـــدا لەقاڵبی کلاسیکی لای دابێ ، هەرچـــــەندە شـــیعرەکانیشی بەتێکرایی لەناوەڕۆکدا ئـــــەو کۆت‌و پەیوەندە کۆنانەی شکاندبێ ؛ بۆیە ئەو گومانەم بێ هێز دەبوو تا لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٠دا هەموو ژمارەکانی گۆڤاری زاری کرمانجیم بەسەریەکەوە وبە بەرگ کـــراوی چنگ‌کەوت‌و هەموو کـــــون‌و قوژبنێکی ژمارەکانیم پشکنی تاگەیشتمە لاپـــەڕە (١٧)ی ژمارە (١٠)ی ســـــاڵی دووەمی ڕێکەوتی ٣ی تەمموزی ١٩٢٧، لێرەدا چاوم بە پارچـــە شیعرێکی بەناو نیشانی بۆ (کاکی کەرکووکی) کەوت‌کە مەبەستی لە شاعیری شۆڕشگێڕی کورد [عبدالخالق ئەسیری]یە و لەژێرەوەشی نووسراوە [کەرکووك : مامەند] ٠

بۆیە دەشڵێم مەبەستی « مامەند » لە «کاکی کەرکووکی» ئەسیرییە چونکە لە ساڵەکانی بیستدا لـــــە مەڵبەندی کەرکووك ئەســــیری شاعیری هـــــەرە ناسراوی کـــــورد بووەو لە ڕوژنامەو گۆڤارە کوردییەکانی ئەو سەردەمە تەنیا (ئەسیری) و (مامەند) لـــە کەرکووکەوە شیعرو نووسینیان بۆ ئـــەو ڕوژنامەو گۆڤارانە ناردووەو جگە لەم دوانە کەم وابووە دەنگێکی ئەدەبی تر لەو مەڵبەـ ندەوە لەســـــەر ڕووپەری گۆڤارەکاندا تومار کرابێ ٠

**بەم جۆرە بۆمان دەرکەوت کـــە (مامەند) ، ئەسیری شاعیری شۆڕشگێری کورد نیـــەو کەسێکی ترەو هەڵبەستە ـ کەشی لـــە ستایشی ئەسیری‌دا گوتووە بریتی‌یە لە چوار (چوارخشتەکی) کـــە هەریەکێکیان سەرواى دێڕی یەکـــەم‌و سێیەمی وەکـــوو یەك‌و دێڕی دووەم‌و چوارەمیشی جـــۆرە سەروایەکی تریان هەیەو ئەم قاڵبەش شتێکی تازە بابـــەتە لەلای شاعیرانی سەردەمی ساڵەکـــانی (بیست، ٠٠٠٠) وبەم جۆرەیە :ـ**

**هەموو ئانێـــك سیمایی پڕ و یقارت وەك چرایی روون**
**لە پێش چـاوم موجەســـەم هەرئەوە تیمسالی میللیەت**
**بەحورمەت ئەی پەرستم پڕتەوێکی فوقی گشت گەردوون**
**فیدای ئەفکاری میللیت بم ئەتۆی لایــق بە قودسیەت**

★

**دەخیلە کاکە کەرکووکی هـــەموو یەکسەر کـــەڕو لاڵین**
**وەتەن بیمارە ، میللـــــەت نوستوە ، هاوارە بەد حاڵین**
**تـــــەم‌و تاریکـــە ئافاقمان لەناو بوتلانا پاماڵین**
**چرای عیرفانت هەڵـــکە باڵ شـــکاو و بێ پەڕو باڵـــین**

★

**ببە ڕەهبەر لەبۆ قەومت پیشاندە حاڵی قەومی کـــورد**
**چ تاریکـــــە سبەینێمان ! چ هەڵدێریـــك لە پێشمانە**
**ئەوا هاوارە ، هاوارە ! گـــــەلێ پێویستە دەستو برد**
**ئەگـــــەر نا تاقیامەت میننەت و زوخـــاوە بەشـــمانە**

★

**وەکوو(فێختە)[8]و(شکسپیر)[9] بۆ نەجاتی قەومی‌مەعسومت**
**لە کۆشین‌و فیداکاری مەکەسڵ تو بکوژرێ گـــــەر !**
**ئەچیتە لاپەڕەی تەئریخ محقق ناوی مەعلوومت**
**ئەبێتە تاجی سەرکوردان ، وەکوو تاجێکی زێڕین فەڕ !**

« کەرکووکی : مامەند »

مامەندی شاعیری نەناسراو و نوێ کەرەوەی شیعری کوردی لەو سەردەمە لەرووی دڵسۆزی‌یەوە بۆ گەلی کوردی خۆشەویستی ، شێوەی ئەسیری شاعیری شۆرشگێری کورد پەروەر دەکات بە پەیکەریکی پیرۆزی میللەت پەروەریو دەی پەرستێو خۆی دەکات بە قوربانی بیرو باوەرە پاکەکانیو داوا لە شاعیری نیشتمان‌پەروەر دەکات کە ببێ بە رابەری رێگەی خەباتو تێکۆشانی رۆڵەکانی میلەتەکەیو ببێ بە هەڵگری چراو مەشخەڵی زانستو عیرفان و ئاسۆی تاریکی ژیانی دوا کەوتوویان بۆ روناك بکاتەوەو وەك فێختەی فەیلەسووفی ئەلەمانو شکسپیری شاعیری شیعری شانۆگەری ئینگلیز چۆن بەفەلسەفەو ئەدەبەکەیان خزمەتی میلەتەکەی خۆیان کردووە ئەویش ئاوا بە بیروباوەری پاکی نیشتمان پەروەریو شیعرە شورشگێریەکانی خزمەتی کەلەکەی خۆی بکات بەم کردەوەیەشی ناوی دیاری دەچێتە لاپەرەی مێژووی تیکۆشان .

ئەگەر ئێمە بەووردی سرنج بدەینە ئەم پارچە هەڵبەستەی (مامەند) ئەوەش لەبەر چاوی خۆمان دابنێین کە شاعیرێك بووە هاوچەرخی (نووری شیخ سالح)و لەشیعر داناندا پەنجە بازی لەگەڵدا کردووە ، ئەوەمان دێتە بیر ، کەشتێك کۆی کردبنەوە تا تام لە شیعری یەکتری وەربگرنو وەڵامی یەکتری بدەنە وە هەروەکوو لەمەوبەر دەرمان بریو شیعرەکەی [بۆ م. نووری] وەڵامدانەوەی هۆنراوەیەکی ( نووری شیخ سالح )ی شاعیری هاورێبازی بووە

ئەم شتەش بەرای من ئەوەیە کە هەردووکیا رۆشبیریی و خوێندەواری‌ـ یەکی تورکیان بووەو شارەزای ئەدەبە نوێیەکەی بوون و لەنوێ کردنەوەی ئەدەبی کوردیدا پەیرەوی ( توفیق فیکرەت )ی شاعیری بەرزی نیشتمان پەروەری سەردەمی ووریا بوونەوەی تورك[10] یان کردووەو دەتوانم بڵێم ( شێخ نووری )و ( مامەند ) دەستەی یەکەمی شاعیرانی قۆناغی نوێ‌کردنەوەی ئەدەبی کوردین . لە بارەی کێشو سەرواو شێوەو موسیقا هەروەك خوا لێخۆش‌بوو رەفیق حیلمی دەڵێ :

**[سەردەمێك شێخ نووری سەرکردەی شاعیرە لاوەکانی کورد بووە لەسلێمانی][11] منیش لەلای خۆمەوە سەرباریك دەخەمە سەر ئەورایەی و دەڵێم : [مامەندیش لەنوێ کردنەوەی شیعری کوردی‌دا لەریزی پێشەوەی شاعیرە لاوە کوردەکانی مەڵبەندی [کەرکووکو هەولێر] وەستاوەو] شان**

بەشانی (شێخ نووری) ملی داوەتە تازەکردنەوەی ئەدەبی کوردی ، لەگەڵ بوونی جیاوازیەك لەنێوانیاندا ئەمەش پتر بەکار هێنانی ووشەی کوردی‌پەتی‌یە لەلای شێخ نووریو هەست کردن بەمانەوەی تارمایی ووشەی دارژراو لەسەر شێوەی تورکی وەك و وشەی (قیامەت) ، (میللەت) ، (قودسیەت)... هتد ، لەناو شیعرەکانی (مامەند)دا ئەم جیاوازی‌یە شیان لەجیاوازی مەڵبەندی پەروەردە بوونیانەوە سەر هەڵدەدا .

لەوکاتەی کە (شێخ نووری)لەسەر شێوەی (توفیق فیکرەت)ی شاعیری تورك پارچە هۆنراوەیەکی بەناوی ( ژیانی ئادەمیزاد )[12] داناوەو لە سەرەتاکەی‌دا دەڵێ :ـ

**ژیانی ئادەمیزاد**

**لەناو شەپۆلی خەما سەرنگوونو بێ ئارام**
**بەکێوی سەختی ژیانا ، بەپێ ، بەچنگەرنێ**
**خەزیکی هەڵمەتی سەرکەوتنە ، بگاتە سەرێ**
**لەپر نشێوی کلۆڵی بواری لێ ئەتەنێ ،**
**بەداوی یەئس وئەلەم تارو پۆی لە ئاخو زام**

لەم پارچە شیعرەدا دێری یەکەمو پێنجەم جۆرە سەروایەك و دێری دووەمو چوارەم جۆرێکی‌ترو دێری سێیەمیش سەروایەکی تایبەتی هەیەو ئەگەر دووبارە سرنج بدەینەوە پارچەهۆنراوەی یەکەم یا دووەمی (مامەند) چاومان بەهەمان شێوەو گۆرینی سەروا دەکەوێو بۆمان ساغ دەبێتەوە کە هەردووکیان شاعیری نوێ‌خوازی ئەو قۆناغەی ئەدەبی کوردی بوونو کۆتو زنجیری قاڵبی شیعری کلاسیکیان تێك شکاندووە .

**مادامکی مامەند ئەوە تواناو پایەی بووبێ لە نوێ کردنەوەی ئەدەبی کوردی لە بیستەکاندا بۆیە بەپێویستم زانی کە زۆر بەگەرمیەوە بکەومەوە سەر لێکۆڵینەوەو بەدوا گەرانی کەسایەتیو ناونیشانی راستەقینەی ( مامەند ) . من بەر لەوەی چاوم بەپارچە هۆنراوەی دووەمی (مامەند) بکەوێ وای بۆ دەچووم کە هەر (ئەسیری) بووبێو جارجار شیعری سیاسی بەو ناوەوە بڵاو کردبێتەوە ، بەڵام دوای دۆزینەوەی ئەو پارچەیەی ئەو بۆ چوونەشمان وادەر نەچوو و دەرکەوت کەئەو نی‌یە !!**

وە لەلایێکی تریشەوە وەك بێتەوە یادم لە هاوینی ساڵی ١٩٦٥دا لەو کاتەی کە چەند ساڵێك بوو گوێزرا بوومەوە بۆ خوارووی وولاتو تەنیا بۆ پشووی هاوینان دەهاتمەوە بەغدا ، لە چاپخانەیەکدا بە مامۆستای نیشتمان پەروەرو ئەدەب دۆست خوالێخۆش‌بوو سابیر ئیسماعیل[13] (١٩١٠ـ١٩٧٢) گەیشتمو کەوتینە گفتوگۆکردنو لەناو

قساندا هاتینە سەرباسی ئەدەبو سەرەتای جوولانەوەی نوێکردنەوە لە ئەدەبی کوردیداو لێمپرسی ئەو [مامەند کەرکووکی]یە کێبووە ؟ لەوەلامدا گوتی :ـ

« **مامەند مامۆستایێکی کوردی کەرکووکی بوو و بۆ ماوەی چەند سالێك لەقوتابخانەی سەرەتایی کۆیە مامۆستامان بوو ، گیانێکی پاکی کوردایەتی هەبوو و شیعری نیشتمانی دادەناو بەلام حەزی نەدەکرد کەس بزانێ کە دەستی شیعرو ئەدەبیاتی کوردی هەیە** • » لێرەدا چەند کەسێکی ترمان هاتە لا کە هیچ پەیوەندییەکیان بە ئەدەبەو ەنەبوو بۆیە قسەکانمان بڕیو کەوتینە سەرباسی گشتی بێ ئەوەی بگەمە هیچ ئەنجامێکی تەواو و بزانم ناوی مامەند کەرکووکی چی بووە ؟ لەراستیشدا ئەوکات لەبەر باری نالەباری وولاتو گیروگرفتی تایبەتی خۆم هێندە بەتەك ساغکردنەوەی ئەوجۆرە بابەتانەوە نەبووم‌و نەم دەزانی کەی دەرگای چاپو بلاوکردنەوەی ئەو جۆرە لێ کولینەوانەمان لێدەکرێتەوە ؟! وەجارێکی تریش وا بەدوو قۆلی بە مامۆستای ئەدەب پەروەرم نەگەیشتمەوەو هەریەکەمان کەوتینە شارێك تا ئەو لە مانگی ئابی ١٩٧٢دا کۆچی دوایی کرد •

ئێستاش زۆر بە تاسەوەم بگەم بە ئەنجامێك و بزانم ناوو شەخسیەتی (مامەند)ی نەناسراو چین ؟ بۆیە دەستم کردەوە بە ساغکردنەوەو لێکۆلینەوە •

**بەووردی یەکەوە چاوم بە (باخی شاعیران)ی چاپی‌یەکەم‌و زیادەی چاپی دووەمی ( مێژووی ئەدەبی کوردی )ی مامۆستا علاءالدین سەجادی دا خشاندەوەو لەناو شاعیرە کۆچ کردووەکاندا چاوم بەناوی هیچ‌شاعیریکی کورد نەکەوت کەبە ناوی (مامەند کەرکووکی) شیعری بلاوکردبێتەوە !!**

لێرەدا ئەمە دوو احتیمالمان لە بەر دەم دادەنێ ، ئەم دوو احتیمالەش ئەمانەن :ـ یەکەم : یان ( مامەند ) تا ئێستا لە ژیاندا ماوە و پیرێکی زۆر بە سالاندا چووە ، بۆیە مامۆستا سەجادی لەباخی شاعیراندا تۆماری نەکردووە • دووەم : یاخود کۆچی دوایی کردووەو مامۆستای ناوبراو هیچ ناونیشانیکی روونی لێ چنگ نەکەوتووە !!

هەندێ جاریش بیرو لێکدانەوەم بۆ ئەوە دەڕۆیشت کە بلێم مامۆستا (عبدالخالق قطب) بووبێ•• بەلام ئەگەر ئەو بووبێو ئەوە سەرەتای شاعیریەتی بووبێ ئەدی بۆچی لە دوایی‌دا چدەنگێکی تری لێوە نەهاتووەو مادامکی ( مامەند ) شان بە شانی (شێخ نووری) هاتبێە مەیدانی ئەدەبی کوردیو بەر لەگۆران (١٩٠٤ ـ ١٩٦٢) دەستی دابێتە نوێ کردنەوەی شیعر ، ناچێتە عەقلەوە وا بەبێ دەنگی خۆی لەمەیدانی ئەدەب کێشابێتەوەو ئەگەر وای کردبێ هۆی ئەوە چی‌بووە و چ نهێنیەك لە دوای ئەو هەلوێستەی‌دا دەوەستێ ؟!

هەر بۆ ساغکردنەوەی ئەو مەسەلەیە لە مانگی شوباتی ئەمسالدا چوومە لای مامۆستا (گیوی موکریانی) بەو ناوەی کە (مدیر ادارە)ی گۆڤاری (زاری کرمانجی) بووەو مامەندیش هەلبەستەکانی هەر لەو گۆڤارەدا بلاو کردوەتەوە ، لەوانەیە بزانێ ( مامەند ) کێ بووە ؟ و لەم بارەیەوە لێم پرسی‌و لەوەلامدا گوتی : « **مامەند کەرکووکی ، کوردێکی نیشتمان پەروەرو خەلکی‌شاری کەرکووك بوو و لە چلەکاندا لە «دائیرەی ئیستیهلاك» فەرمانبەر بوو ، وەختی‌خۆی چەند پارچە شیعریکی نایابی پڕ جۆششی نەتەوەیی بۆ ناردینە (رەواندز)و لەسەر خواستی خۆی بەناوی (مامەند کەرکووکی) بۆمان لە«زاری کرمانجی»دا بلاوکردەوەو ، کاکم (حسەین حوزنی موکریانی) دەی ناسی بەلام من نەم دەزانی کێیە ؟ تا لە سالی ١٩٤٣ یا ١٩٤٤دا جارێکیان لە رێگای چوونە بەغدام لەچایخانەیێکی پردێ ( ئالتوون کوپری ) یەکێکی کەمێك بەسالاندا‌چووم لێ‌هاتە پێش‌و خۆی پێشکەش کردم وگوتی : (منم مامەند کەرکووکی) و ئێستا لە دائیرەی ئیستیهلاکی (پردێ) شکرانەکردو ئێمەش لەو کاتەدا نە(زاری فەرمانبەرم‌و زیاتر ناوی خۆی نا کرمانجی)و نە (روناکی)مان دەر نەدەچوون تا داوای بەرهەرمی ئەدەبی تازەی لێ‌بکەم بۆ بلاوکردنەوەو ئەویش نەهاتە سەر باسی ئەدەبی تابزانم هەستی شاعیریەتی وەکوو جارانە یان ووشك بوەتەوە ؟!**

**لێرەدا مامۆستا «گیو» مامەندی کرد بەفەرمانبەر لەدائیرەی ئیستیهلاك و مامۆستای خوا لێ‌خۆش‌بوو « سابیر ئیسماعیل »یش گوتی : « مامۆستا » بووە !!**

ئینجا ئەگەر (مامەند) لەبیستەکاندا ماوەیێك مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بووبێ وەك مامۆستا «سابیر» بۆی گێڕامەوەو لەدوایی‌دا هەروەك گەلێ لەمامۆستایانی‌تر خزمەتی خۆی گواستبێتەوە بۆ فرمانیکی‌ترو چووبێ بۆ (مالیە)و بووبێ بە فەرمانبەری‌ئیستیهلاك هەروەك مامۆستا «گیو» دەی‌گێڕیتەوە ، ئەوا هەردوو رایەکەیان راستو لە بارن •

هەر بۆ ئەم مەبەستەش لە پشووی نیوەی ساڵی ئەمساڵدا لە هەولێر چاوم بە [دوکتور مارف خەزنەدار] کـەوت‌و بـسی [مامەند کەرکووکی] و نـــوێ کردنەوەی ئەدەبی کوردیم هێنایە گۆڕو بە دوکتور خەزنەدارم گوت :

**[ئێوەش لەنامەکەی دوکتۆراتاندا لەمامەندەوە دواون‌و نموونەیەکتـــان لەشیعرە نەتەوەییەکانی هێناوەتـەوە ، ئایا بۆتان ســاغ بوەتەوە ئەو مامەندە کێ بووە ؟! ]**

ئەویش لەوەڵامدا گوتی :

**[ بەڵێ نمونەی شــیعری مامەندم هێناوەتەوەو ئەوەندم بۆ دەرکەوتوە کە ( نوری شــێخ ساڵح ) و ( مامەنــد کەرکووکی ) دەستەی یەکەمی نــوێ ـ کردنەوەی شـــیعری کوردین‌و منیش نازانم ئـەو مامەندە کێ‌بووە و حەزیش دەکەم بزانم کێیە ؟!] وە بەڵێنی پێدام** کە ئەو [نصە]ی کە لە بارەی (مامەنـد کەرکووکی) یەوە بەروسی لـە نامەکەی دوکتـۆرایدا نووسیویەتی ، بـــۆم وەربگێڕێتە سەر زمانی کوردی‌و بـــۆم بنێرێ‌و زۆری پێ نەچـــوو بەڵێنەکەی بەجێ گـــــەیاندو پڕ بەدڵ سوپاســی دەکەم .

ماویەتی

پاشماوەی لاپەرە (٣١)

ئەقنـــەقی ســــەر منارەکە ، **بەڵام ئەو زۆر بەدڵ** نیایی‌یەوەو لەســـەر یـەك پێ ئەیڕوانی‌یە دەشـــتە **بەپیتەکەی گەرمیان پەڵ هاویشتن‌و کش کـــردن هەڵی نەفران زرمەی تفەنگێك باڵی پێدا بەیەکداو جیقنـــەی سەرمنارەکەش ســـوور هەڵگــەرا . تەماشایەکی یەکتریان کردو بێدەنگ دەستیان کرد بەجگەرە تێ‌کردن .**

## چیرۆکی چوارەم :

## پاشماوەی لاپەرە (٢٥)

بۆ ئاخێزی هەڵسانەوە
سروودی قوڵپی سەنگەرە
کە بۆ شەو چوینە کوڵگەوە
لەگەڵ شیپی سەد خەنجەرا بەرانبەرە
لەناو خونچەی ئاگرە سوورەی بەربەیانا
خۆی ڕابەرە .

لە پەردەی بووك وزاوادا ، باوەشی ناز و ئارامە
لە چاوی بووکی روو سوورا
هەزار بێشکەی پڕ لە کامە
خۆ بە قسەی خۆیشم نەبێ
بەستەیەکم تیا خوێندەوە
لە کوردستان هۆنرابوەوە
بەستەیەکم تیا خوێندەوە

لەرەش بەلەکی ڤیتناما خوێنرابوەوە
لەکۆلانێکی (غەزە)دا ...
لە ناو گەرووی خەوی تالا
هەڵکرا بوو وەکوو ئالا
بەسەر گڵ کۆی (لۆمۆمبا)دا

خوینی (محجوب)ی گڕ ئەدا
لە جەنگەلێ ( ئەفریقا )دا
تۆوی لە داری زڕ ئەدا
لەناو گەرووی (بۆڵ رۆبسن)دا
دەنگی (ئەنجیلا)ی خول ئەدا

لە زنجەکەی (مامە تۆم)دا
عارەقی سوێری (هارلم)ی
لە پەترۆی زام و گڵ ئەدا
« باوەگوڕگوڕ » کە کەوتە ژان
بەیتی کۆڕی شەوارە بوو
بۆ ڕەسەنی‌ی ئەم میللەتە
تاپۆی رەش و قەوارە بوو
کوێ گرەکان

ماوی چیرۆك بۆ سبەینێ
سبەی ڕۆژێکی نوێ ترمان بۆ ئەڕوێنێ
سبەی بەستەی ئازادی‌یە
کە «لاوك» خۆی ، تیا ئەنوێنێ
سبەی چاوی چاوەڕوانی
شنەی ئاونگ ئەی شواتەوە
سبەی دایە گەورەی ئێمەش
خورجی مێوژ ئەکاتەوە

هەر کەسەو پێکی دەستی خۆی
لە چاوی ڕەنج ئەخواتەوە
چەپکێ گوڵ و چەپکێ نێرگز
مەرگتان نەبینم هەرگیز ...

# کورتەی چوار چیرۆکی
## لەجگارەدانیشر .

ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل

قۆڵ وەشاندنی مام عـــەبدل بـــە درێژایی ڕۆژگارو کەنەفتی لەشـیی ئازاری باریکی پشتی ، کاتێ زەردەپەر ئەگـــەڕایەوە خێزانەکەی بەدەستە سپی یە گۆشتینەکانی ئەیشـێلاو بەدەم تریقـــەی پێکەنینەوە چـــای لەسەر چـــای بۆ تێ ئەکـــرد ئەحەسایەوەو ماندوویەتی لەلەش دەرئەچو •• بەو پەڕی خۆشەویستی و ئارەزووەوە چـــاوی بڕی یە چاوە کاڵەکانی •

**ڕوانییە ئەو دوو دەریایە زیاتر هەستی بـــە ئارامی پێ ئەکردو هێزو توانای ئەخستە بەر ، لەپڕ وەك زۆر جاری ترو لەم ساتانەدا لەئاسۆی ئـــەم کامەرانی یەدا تەمێك لە ناخی هەردووکیانا ئەکەوتە نش و نماو تارایەکی ڕەشـــی ئەدایە ســـەر ئـــەو خۆشی یە •**

زۆر جـــار بەتەنیا دائەنیشت ، سوخمەکەی ئەترازان و ئەیڕوانی یە مەمکەکانی و گۆی ســـوور هەڵگەڕاوی « **هـــەر بۆ دەمی ساوایەکی خنجیلانە ئەشێ** » ، دەستی ئەخستە سەرڕانی و بەدەستەکەی تریشی وەك کۆرپەی لەباوەشا بێ بە دوو پەنجـــە گۆی مەمکی ئەگرت بـــۆ دەمی ، چـــەند جارێکیش لەپارچە قوماشی سەوزو سپی و زەردو سوور بۆی ئەبڕی و لەبوخچەدا گرێی ئـــەدا •• ســـەری ناوە بان ڕانیەوە بێ ئەوەی تەماشای ڕوومەتی بکا دەستی برد بەدوو پەنجە یاری بەگۆنای ئەکرد

« **چی ئەبوو گەر منداڵێکم بوایەو بەم چەشنە لەئیش و کاری ناو ماڵەی بکردایەم و بەم جـــۆرە سەرە بچکۆلەکەیم بنابایەتە سەرڕانم** » •

لـــەپڕ بێ ئەوەی لەدەسەڵاتیابێ و گلی باتـــەوە فرمێسکێکی گەرم کەوتە نیو چەوانی •

ـ ئەگری ؟! •• چەند جارم پێ ووتی ئەمان بێ ئەمڕۆ نەء سبەی ، چەند جارێ سکت پڕ بوو کەچی بە نیوە چڵی ••••

« **هیچم لە پیـــاوان کەمتر نی یە ، لەقـــۆڵ وەشاندن و ئیش و کاریشدا کەس پێم ناگات •• پیاوی ڕەش ، سپی هەمووی توانای ئەوەیان هەبێ منالیان ببێ من نەبێ •••**

★

لەگـــەڵ شوللە وەشاندن دا تارمایی منالێکی خنجیلانە بەرچاوی ئەگـــرت •• تریقەی پێکەنینی ئـــەو دەشتەی ئەگرتەوە ، دەستی بۆ کێلگەکانی دەوروپشت درێژ ئەکرد ••

**گەورەبوو •• گەورەبوو ، ســـەری گەیشتە لوتکەی شاخەکەی تەنیشتی ، ســـەری هەڵبڕی ، سێبەری شاخەکان دابویان لەیـــەك • وەك هەموو ڕۆژانی رابووردوو بەزەردە خـــەنەیەکی گـــەش ماندوونەبی لێ کرد ، بەڵام گەلێ جیاواز لەئێوارانی رابووردوو ، چاوی بڕی یە دوو دەریاکە هەستی کرد وا زەردەخەنەکەی خەریکە لە باڵەفرێ بکەوێ گورج دەستی گرت و ووتی**

ـ ئەم جارەیان بەنیوە چڵی نابێ و منالێکی چاو کەشمان ئەبێ •

## چیرۆکی دووەم :

نەمن نەچالاکی کوڕم مامە فرویدمان نەدیوە ، من شتێکیم خوێنبێتەوە خۆ چـــالاك هەر ناویشی نەبیستووە ، ئەگەر لەژیاندا ئەبوو قەرزی هەزارم بۆ ئەکردو بۆ لێکدانەوەی ئەم خەونەی چالاك خۆم ئەکەیاندە خزمەتی خەونەکە :

**گەردە لولێ هەڵی کرد قرچـــە قرچی خستە درەختەکانی سەر شەقامەکان ، گوڵی ناو باغچەکانی وەراند ، ماڵەکان پەنجەرەو دەرگاکانیان داخست ، دەعبایەك لە قـــیر ڕەشتر هەموومانی خزانە ناو عەمارێکی ئاسنەوە ، دایکم لە گەرما یەخەی خۆی دادڕی •• مەمکەکانی کەوتنـــە دەشت ، هـــەڵ قرچابوون •• تینووم بوو مژم ناوە مەمکەکانیەوە هیچی تیا نەبو ، دایکم فرێمی داوە دەرەوە کابرا بەدایکم پێ ئەکەتی کاتێ لەخـــەو هەستام لەشـــم** زەنگۆڵ زەنگۆڵ ئارەقی پیا ئەهـــاتە خـــوارەوە ، ئەوەبوو تۆ لێفەکەت کێشا بەسەرماو توند خۆم نووساند بەتۆوە •

ـ **چەند جارم پێ ووتی ئێواران شتی چەور مەخۆ •**

## چیرۆکی سێیەم :

هەردووکیان یەشتا حەپەساوی چـــاو زەق ـ کردنەوەو جوین دانی ناشرینی کابرای ( قشلە ) بوون ، لەکـــەنار شەقامە گشتێکە دانشتبوون و چاوەری ئوتۆموبیلیان دەکرد ، زرمەی پێی دوو پاسەوان سەرنجیانی ڕاکێشا •

لەجگەرە تێ کردن کەوتن ، هەموو لەشـــیان بوبە چاوو ترسی دوتیاش لەروو مەتیان کۆبووەوە ، ســـەرو شایەتمانیان هێنـــا کاتێ بەرەو منـــارە عەبباسی یەکە ڕۆیشتن •

یەکێکیان بەباڵ چەند جاری کشی کرد لـــە

**پاشماوەی لە لاپەرە (٣٠)**

# له بیره‌وه‌ری
# رۆشنبیرانی
# کورد دا



حسێن حوزنی موکریانی
له ٢٠/٩/٩٤٧ دا
کۆچی دوایی کردوه



سالح قه‌فتان
له ٣٠/٨/٩٦٨ دا
کۆچی دوایی کردوه



محمد علی مصطفی
له ٢٠/٨/٩٧٢ دا
کۆچی دوایی کردوه

## عەلی جۆلا

- لە هەڵەبجە ساڵی ١٩٤٢ لە دایك بوە ·
- لە دەرچوانی ئەکادیمیەی هونەرە جوانەکانی بەغدایە بەپلەی أمتیاز ساڵی ١٩٦٦ ·
- لەم پێشانگا هونەریانە بەشداریی کردوە ·
- پیشانگای گرافیك لەئەڵمانیای دیموکراتی ·
- پیشانگای مامۆستایانی پەروەردەی هونەری لەبەغداو مەدالیەیەکی بەخەلات وەرگرت ·
- هەموو پیشانگایانی هونەرمەندانی سلێمانی ·
- پیشانگای گەڕۆك لە بەغداو موسڵو بەسرە ·
- پیشانگایەکی تایبەتی خۆی لەمەڵبەندی رۆشن بیریی سۆڤیتی کردۆتەوە ساڵی ١٩٧٢ ·



هونەرمەندانی



وێنەی یەکەمی بەرگ : تاڤگەی بێخاڵ ( فوتوگراف )

وێنەی دووەمی بەرگ : دیمەنێك لە کوردستانا ( فوتوگراف )


BAYAN

**Kurdish Monthly Magazine**

*Published by the Ministry of Information*

**Al-Tadhamun Kurdish House for Printing and Publishing**

BAGHDAD, IRAQ.